بسم الله الرحمن الرحيم

زنجیرە کتێبی گۆڤاری

ڕێنوێن


- ناوی کتیب : هەنگاوێك بەرەو هاوسەرگیری
- نوسینی: نهاد جلال حبیب الله
- دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن
- ناوی زنجیرەی : زنجیرە کتێبی گۆڤاری ڕێنوێن
- ژمارەی زنجیرە : یەکەم
- تیراژ: ٥٠٠
- چاپ : چاپخانەی پەیوەند
- ژمارەی سپاردن : (١٢٥٦) ی ساڵی ٢٠٠٩
- نۆبەی چاپ : یەکەم
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٨
- ئیمەیڵ: renwen٢٠٠٩@yahoo.com
- ماڵپەڕ: www.aubyc.com
- ژ.مۆبایل: ٠٧٧٠١٩٣٢٧٤٩





## پێشکەشە:

- بە دایک و باوکی ئازیزم، خوای گەورە پاداشتی رەنج و پەرستش و دڵسۆزییان بداتەوە.
- بە هەموو کوڕو کچێکی ئوممەتی ئیسلام.
- بەوانەی بۆ هەموو کارێکی ژیانیان دەگەڕێنەوە بۆ بڕیاری خواو پێغەمبەر (ﷺ).
- بەوانەی تامەزرۆی دیداریانم و لێیان دوورم.



# پێشەکی

**سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە سەلات و سەلام لە ئالو بەیت ویارانی.**

**لەگەڵ دروستبوونی مرۆڤدا، خوای گەورە دوو ڕەگەزی نێرومێ دەکاتە پێناوی حەسانەوەی یەکترو پەیامی خۆی بۆ ئادەمیزاد دەنێرێت و بەردەوامیش بەدوای یەکتردا هاتنی ئایین و پێغەمبەران لە پێناو ڕێنوێنی مرۆڤەکاندا بووەو بەهاتنی ئاینی ئیسلام کۆتاییهات، ئایینێک کەخاوەنی دیارترین ئەم سیفەتانەیە:**

**١- کاملی و بێ کەموکوڕی** ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ المائدة: ٣

**٢- ڕوونکردنەوەی هەر شتێك کە بووەو هەیەو دەبێت** ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ٨٩﴾ النحل: ٨٩

**٣- گشتگیرەو لە سنوری کەمینەیەکدا بەرتەسک نەبووەتەوە** ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء: ١٠٧

**پاشان لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و دواتر هاوەڵان و خەلیفە ڕاشیدیەکان پێشەنگیەکی بۆ موسڵمانان بەجێهێشت و لە مێژووی دواتری موسڵماناندا وێنەیەکی تا ئەستێکی**







زۆر سەرکەوتو ی پێشەکەشکرد، تا گەشتە سەردەمی ڕووخانی خیلافەتی ئیسلامیو بەردەوامبوو تا ئەمڕۆی ئێمە کەجیهانی ئیسلامی لەلایەن دوژمنانیەوە بەرەو ڕووی چەند شالاْوێکی توند بووەتەوە، لەوانە:

١- شالاْوی فیکری: بەجۆرێك وایانکردووە نوسینە گومانـاویو سنورداره‌کانی خۆیان لای موسڵمانان کردوەتە سەرچاوەی سەرەکیو قورئانو سوننەتو نوسینەکانی ژێر سایەیان کردوەتە سەرچاوەی گومان یان بەلای کەمەوە سەرچاوەی دووەم.

٢- شالاْوی ڕەوشتی: ئافرەتیان بێبەرگ خستو کردیانە بانگەشەیەك بۆ کالاْکانیان وپێناوێك بۆ پڕکردنەوەی ئارەزوەکانیان و یارمەتیەك بۆ کارەکانیان و دواجاریش پێناوی بازرگانیکردن بە رەگەزو سێکس و جەستەیان، ئەمەشیان بەسەر جیهانی ئیسلامیدا سەپاندوە، ئیتر لەهەندێ شوێندا گەشتۆتە پلەی بالاْو لە هەندێ شوێنیشدا لە قۆناغی جێبەجێکردندایە.

٣- شالاْوی ماددی: بەمەش جیهانی ئیسلامیان کردوەتە بازاڕێك بۆ شمەکەکانیان و ئامانجێك بۆ دزیو جەردەیی خۆیان و ڕێگەیەکیش بۆ پەیداکردنی کۆیلەو بەکرێگیراو بۆ کارەکانیان.







**٤- شالأوی ئایینی: هەوڵدەدەن ئایینە خورافی و هزرە مرۆییەکان بەسەر ئایینی یەکتاپەرستیدا زاڵبکەن، ئەمەشیان جێبەجیکردووە، جا چ لەڕێگای مەسیحیەتەوە وەك (فلیپین و حەبەشە) یان ڕەوتی ملهوڕی یەکیەتی سۆڤیەت یان عەلمانیەت کە ئەمڕۆ زاڵەو خۆی سەپاندووە.**

**٥- شالأوی سەربازی: ئەمەش خۆی لە شالاوی خاچپەرستان یان شالأوی ماددیخوازان بەئامانجی نەوت یان پێگە ماددیەکان یان هەر پێناوێکی تر، هەڵمەتی جولەکە کە هێشتا لە سەرەتادایە، جگە لە خەنجەرە ژەهراویە ناوخۆییەکان، هاوکات هەڵەیەکی گەورەیە کە تاوانەکان یەکپارچە بدەینەوە بەسەر دوژمنانی ئیسلامدا، بەڵکو کەمتەرخەمی موسڵمانان و خەوتوییان وایکرد توشی ئەو چەرمەسەریە ببن، بۆیە حاڵی ئەمڕۆیان لەوپەڕی دواکەوتەیی ئایینی و زانستی و هزریو مادی...هتد دایە بەلأم هیوای چارەسەر نەبڕاوەو گەنجانیش ئەو توێژە بنەڕەتیو یەکەمینەن کە جێی ئومێدی سەرپێخستنەوەن.**

**بەلأم گەنجی موسڵمان بۆ ئەوەی هەوڵی خۆی بخاتەگەڕ،سەرەتا پێویستی بەوە هەیە خۆی لە گرفتوڕێگرەکان ڕزگاربکات، هەروەها سوکنایی وەربگرێت، یەکەمین فشارێکیش موسڵملن بەرەوڕووی ئەبێتەوە کێشەی**







**جنسیه واتە بێهاوسەری، کەبەداخەوە لە کوردستانی ئازیزماندا خەریکە ڕوو لەزیادبوونە.**

**ئیسلامێك کە ڕوونکەرەوەی هەموو شتەکانە ناکرێت چارەسەری ئەمەی پێ نەبێت، بەڵکو دەبێت لەمبارەیەوە پەیامێکی پێبێت کە جێی رەحمەت بێت بۆ هەمو مرۆڤایەتی، بەڵام دەشێت بێئاگایی تاکی موسڵمان وایکردبێت ئوممەتی ئیسلام لەمڕۆدا لەو بوارەوە گیرۆدە بێت و بەدەستیەوە بناڵێنێت.**

**لێرەدا پشت بەخوا هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی پوختو سەرەتایی تیشکێك لەوبارەیەوە لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتو پێشینەی (سەلەفی سالح ) و ڕاستی زانستی سەردەمەوە بۆ کوڕوکچی کورد بخەینەڕوو، بەڵکو سەرەتایەك بێت بۆ شارەزایی و ڕۆشنبیری زیاتر لەوبارەیەوەو هەوڵێك بێت تا لەدواتردا بە شێوەیەکی وردترو قوڵتر بنووسرێت.**



لەم کورتەنوسینەدا هەوڵدەدەین ئم لایەنانە بخەینەڕوو:

١- دیدو بڕیاری ئیسلام بۆ هاوسەرگیری.

٢- خۆشەویستی لەپێش هاوسەرگیری لە ئیسلامدا.

٣- هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان.

٤- ئامانج و ئەنجامەکانی هاوسەرگیری.

٥- قۆناغی هاوسەرگیری.

٦- ماف و ئەرکی ژن ومێرد.

٧- قۆناغی دوای هاوسەرگیری و بوونی منداڵ.

٨- پەروەردەکردنی منداڵان.

بەدڵنیاییشەوە هەر کارێك بێ هەڵەو کەموکوڕی نابێت مادام مرۆڤە توانا سنوردارەکان ئەنجامی دەدەن، مەگەر پێغەمبەران لەوەدا سەرکەوتووی تەواوبن، ئەم کارەش هەوڵێکی دڵسۆزانەو سەرەتاییە، بەهیوای ڕەزامەندی خوا لەپێش هەموو شتێك و پاشان سوودبەخشی خوێنەری بەڕێزو ئومێدی نزای خێر لەهەر کەسێك ئەگەر تەنها یەك نزاش بێت.

﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾﴾ هود: ٨٨

نهاد جلال

١٤٣٠/٢/٢٩ك. سلێمانی

nihad hawramay@maktoob.com

بەهیوای ئەوەی ڕەخنەو پێشنیارەکانتان لەسەر ئەم نووسینە بخەنە ڕوو.







## (دیدو تێڕوانینی ئیسلام بۆ هاوسەرگیری)

**لە ئیسلامدا هاوسەرگیری کارێکی دروست و بەڵکو خێر و دواتر ئەرکێکی پێویستی سەرشانی موسڵمانە، بەڵکو ئیسلام هەوڵدەدات سەرەتا بەربەستەکانی بەردەم هاوسەرگیری لاببات، پاشان پاڵ بە پرۆژەی هاوسەرگیریەوە بنێت، دواجاریش ئەو پرۆسەیە بپارێزێت. خوای گەورە لە قورئاندا بە دەربرینی فرمانی (أنكحوا)، پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرموودەدا بە دەربڕینی فرمانی (فليتزوج) قسە لەسەر هاوسەرگیری دەکەن، واتە هەردووکیان فرمان بە هاوسەرگیری دەدەن و دەیکەنە ئەرك لەسەر موسڵمانان.**

**لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:** ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ﴾ الأعراف: ١٨٩ **ئەگەر سەیر بکەین خوای گەورە بۆدەرەنجامی هاوسەرگیری سوکنایی دێنێت، واتە پێش هاوسەرگیری سوکنایی لای گەنج نیە، گەنج لەپێش هاوسەرگیری لە ڕاڕایی و دوودڵیدا دەژی، دڵودەروونی ناسك دەبێتەوە، هەمیشە لە کڵپە و سەروخوارکردندایە، ساتێك گەنارگیر و بێتاقەت، ساتێك بزێو و پڕ جموجووڵ، ساتێك بەئومێد، ساتێك بێئومێد،**



**دەمێك بەتوانا، دەمێك دامركاوە و تەمبەڵ...هتد، چونكە پێویستی بە سوكناییە و سوكناییش لە هاوسەرگیریدایە.**

**هەروەها خوادەفەرموێت:** ﴿ وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٣٢ ﴾ النور: ٣٢ **لێرەدا خوای گەورە ڕاستەوخۆ فرمان دەكات كە ئافرەتانی شوونەكردوو بەهاوسەربگرن یان پیاوانی بێژن بەوجۆرە نەمێننەوە، واتە ئافرەتان (كچ یان بێوەژن) پیاوانێك كە ژنیان نیە فرمانیان لەسەرە كە دەبێت بەوجۆرە نەمێننەوە، فرمانەكەش بە پلەی یەكەم ئاڕاستەی پیاوان كراوە. هەوەها لەقورئاندا هاتووە:** ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٢١ ﴾ الروم: ٢١ **دووبارە لێرەدا سوكنایی خاڵی یەكەمی دوای هاوسەرگیرییە و بەدوای ئەوەشدا سۆز و میهرەبانی دەكەوێتە نێوانیانەوە، لێرەدا كارەكە خوای گەورە دەیكات، واتە خوای گەورە ئەو سۆزە دەخاتە نێوان ژن ومێردەكەوە.**

**هەروەها لەبەرئەوەی بۆهەموان نیشانی بدات كە هاوسەرگیری كارێكی چاكوپاكە، ئاماژە بەوە دەكات كە پێغەمبەرانیش هاوسەرگیرییان كردووە، وەك دەفەرموێت** ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ ﴾ الرعد: ٣٨





**هەروەها ئەگەر سەیری سەرەتای ژیانی مرۆڤ بکەین، دەبینین خوای گەورە ئادەم (علیه السلام) بە تەنها ناهێڵێتەوەو دایکە حەواش دروستدەکات تا بە مرۆڤایەتی نیشانبدات کە ژیان بە هاوسەرگیری دوو رەگەزی جیاوازی نێرومێ بەڕێوەدەچێت، ئەگەرنا بوونی ئادەم بەتەنها بەسبوو، یان دوای ئەوەی لە یەکتری دوورخستنەوە، بە یەکتری نەدەگەیاندنەوە.**

**پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەهەمانشێوە لە فەرموودەکانیدا گرنگی بە هاوسەرگیری دەدات و لەوبارەشەوە کتێبەکانی فەرمووده چەندین فەرموودەیان لەخۆگرتووە. لەوانە ئەو فەرموودەی هەریەك لە ئیمامی بوخاری و موسلیم هێناویانە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ( یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج، فأنه أغض للبصر وأحسن للفرج، ومن لم یستطیع فعلیه بالصوم فأنه له وجاء). زانایان لەبارەی مەرجی واجببوونەوە ڕاجیاوازن، هەندێك دەڵێن هەرکەس توانای جنسی هەبوو ئەم فەرموودە دەیگرێتەوە تا هاوسەرگیری بکات، هەندێکی تر دەڵێن بەڵکو مەبەست توانای هاوسەرگیری و پێویستییەکانێتی، بۆیە کەسێك ئەگەر توانای جنسی هەبوو**







**بەڵام نەیتوانی هاوسەرگیری بکات، ئەو کاتە ڕۆژووگرتن بۆی باشترە.**

**دەی ئەگەر کەسێك هەردوو مەرجەکەی تیادابوو، ئەوا بێگومان هاوسەرگیری لەسەری واجب دەبێت، پاشان ئەو بەربەستانەی دێنەڕێی گەنج تا هاوسەرگیری نەکات بریتین لە:**

## نەبوونی دارایی و ترسی دارایی:

**بەدەستەوەنەبوونی هیچ داراییەك کێشەیەکی بەردەم هاوسەرگیریەو ناشبێت سەرکۆنەی ئافرەتان بکرێت ئەگەر ئەوە لەبەرچاوبگرن وەك پێغەمبەرﷺ لە ئامۆژگاری فاتیمەی کچی قەیسدا کاتێك موعاویە چوەتە داوای ئەوەی بۆ ڕووندەکاتەوە کە موعاویە(ڕەزای خوای لێبێت کەسێکی بێماڵوسامانە( أما معاوية فصعلوك لا مال له)**رواه مسلم **بەڵام ئەمە ناکرێتە بیانوو بۆ هاوسەرگیریو بوونی سامانێکی کەم بەسە وەك هاوسەرگیری عەلیو فاتیمە(ڕەزای خوا لەهەرکیان) زۆر گەنج هەن ترسیان لەوەیە کە ئەگەر بنەونە هاوسەرگیری، لەڕووی دارییەوە شکست دەخۆن، ئایا لەسەرەتادا بێت یان لەدواتردا.**







## چارەسەری ئیسلام

**سەرەتا ئیسلام ئەم چارەسەرانەی داناوە:**

**١- هەوڵبدەیت وەك كوڕوكچ هەردووكیان و بنەماڵەی هەردوولا ئەركی هاوسەرگیری كەمبكەیتەوە، چونكە لێبوردەیی لەوەدا باشترە. پاشان یارمەتیدانی موسڵمانانی چواردەور كە ئەركی سەرشانیانە یارمەتی یەكتر بدەن ئیتر چ لە ئاستی تاك یان ڕێكخراو یان دەوڵەتدا، تەنانەت لە مێژووی ئیسلامیدا نمونەی فەتوای خەلیفەی موسڵمانان و زانایانیش هەیە كە زەكاتیان بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری بەكارهێناوە.**

**بەڵام ئەمەش بە هاریكاری هەردوولا پێویستە، ئەگەر موسڵمانێك هەزار دۆلار ببەخشێت بە گەنجێك بۆ هاوسەرگیری، بەبوونی هاریكاری بنەماڵەی هەردوولا و هەستی بەرپرسیاریەتی هەموان، دەكرێت ئەو دەهەزار دۆلارە دوو گەنجیتر لەو گرفتە چارەسەر بكات و بیانباتە قۆناغی هاوسەرگیرییەوە. هەروەها ئەگەر نەتوانرا هاوسەرگیری ئافرەتانێكی دیاریكراو بكرێت، ئەوا با لەئاستی خوارەوەی كوڕ یان كچیشدا بێت وەك خوا**







**دەفـــەرموێت:** ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ﴾ النساء: ٢٥

## سەبارەت بەدوای هاوسەرگیری:

**شـەیتان مـرۆڤ دەترسـێنێت ئەگـەر هاوسـەرگیری بکـەیت شکستی ئابووریـت تـووش دەبێـت، قـەرزار دەبیـت، موچـەت نابێت، سەرناکەویت، بێ نان‌وئاو دەکـەویت، خانوو نابێـت، ژیان سەختە...، ئەمە بەم بەڵگانە لە ڕووی شـەرعیەوە تـەنها ترسی شەیتانەوە و بەس:**

**١- خوای گەورە دەفـەرموێت:** ﴿ الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ ۖ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾ البقـرة: ٢٦٨ **خـوا لێرەدا ئـەوە دەخاتـەڕوو کـە ئـەو ترسـانە بـەڵێن و بڕیـاری شـەیتانن، بـەڵام ئەگــەر دەتــەوێت بــەڵێنی خــوا لەوبارەیـەوە وەربگریـت ئـەوا لێبـوردن و فـەزڵ و بەخـشش دێتەڕێت.**

**٢- خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** ﴿ وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ ﴾ النور: ٣٢ **ئەگەر هەژارن خوا لـە فـەزڵی خۆی دەوڵەمەنـدیان دەکات.**



**دەی موسڵمان ترست چیە؟ بەڵێنی شەیتان بەسەرتدا زاڵەو ترست لە بەڵێنی خوایە؟ لە ڕووی عەقڵی و ئەزمونیشەوە ژیان ئەوە نییە کە تۆ لە قۆناغێکدا بمێنیتەوە، بەڵکو هەمیشە سەرکەوتن لە گۆڕانەکاندایە، ئەزمونی ژیانیش سەلماندویەتی، چەند هەزار هاوسەرگیرییان کرد و دواتر خوا دەوڵەمەندی کردن، مەگەر زۆربەی دایكوباوك و باپیروداپیرەکانمان وانەبون؟ مەگەر ژیان لەوە سەختترە کە تۆ لەیەکەم ئارەزووی ژیان بێبەش بیت، خوا دەفەرموێت:**

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ﴾ آل عمران: ١٤

**بۆیە یەکەم خۆشی و ئارەزووی ژیان لەبەر ترس لەداهاتوویەك وەلانانرێت کە هێشتا نەهاتووە، مرۆڤیش توانای سەرکەوتنی هەیە، دڵنیابە دەتوانیت بژیت ئەگەر بڕیار بدەیت، ئەگەر خوا دروستی کردویت و ئەو پرۆژەیەشی بۆ داناویت، دڵنیابە داهاتویشی لەبەرچاوگرتویت. بۆیە لەترسی شەیتانیەوە بەرەو دڵنیایی و هیوابەخشی خودایی هەنگاوبنێ، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە پێناوەکانی ڕێ لەبیرمەکە.**







هـەروەك لـە فەرموودەیـەكی تـری ئیمـامی بوخـاری و موسلیمدا هاتووە كە سێ كەس هاتنـە ماڵی پێغەمبـەر (ﷺ) پرسیاریان لە دایكمان عائیشە كرد پێغەمبـەر چی دەكات و چۆن دەژیـت، كاتـێ وەڵامیـان وەرگـرت یـەكێكیان بڕیاریـدا هەرگیز هاوسەرگیری نەكات، ئەویتر هەرگیز گۆشت نەخوات، ئـەویتر هـەرگیز ڕێكوپێـك نەخـەوێت، كـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئەمـەی بیـستەوە سـەركۆنەی ئـەو كارانـەی كـرد، چـونكە ئیسلام هـاتووە تـا چێـژ بـە ژیـان بـدات، نـەوەك چێـژەكان لـە ژیان بسەنێتەوە، بۆیە لە وتارێكدا پاش سوپاس و ستایشی پەروەردگار فەرمووی: ((ما بال اقوام قالوا كذا زكذا، لكني أصلي وانام، وأصوم وافطر، وأتزوج النساء، فمن رغب عن سنتي فليس مني)).

ئیمـامی حـاكم لـەكتیبی (المـستدرك علـى الـصحيحين) دا فەرموودەیەكی پێغەمبەری ﷺهێناوە كە دەفەرموێت: (( من رزقه الله امرأة صالحة فقد أعانه على شطر دينه، فليتق الله في الـشطر البـاقي)) (صـحيح). واتـە: هاوسـەرگیری زامنـی نیـوەی ئیمانـە و نیوەكـەی تریـشی دەبێـت هـەردوولا وریـای بـن. هـەروەها لـە فـەرموودەی پێغەمبـەردا (ﷺ) مـژدەی خـوا هەیـە كـە هەركـەس نیـازی خێـری هاوسـەرگیری هـەبێت خـوا یارمـەتی دەدات و قـەرەبووی هەژاریەكەشـی دەكاتـەوە و






**دەستگیرۆیی دەکات، وەك ئیمامی ترمزی و نسائی بە پلەی (حسن) ئەم فەرموودەیان هێناوە: (( ثلاثة حق على الله عونهم: المجاهد في سبيل الله، والمكاتب الذي يريد الأداء، والناكح الذي يريد العفة )).**

**بە ریوایەتی صەحیحی ئیمامی ئەحمەدیش پێغەمبەرﷺ وەك جەختکردنەوە لەو ئایەتەی قورئان کە باسی هاوسەرگیری پێغەمبەرەکانی دەکرد، لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێت: (( أربع من سنن المرسلين، التعطر والنكاح والسواك والحياء )) یان لە فەرموودەی تردا لەناو دە خەسڵەتی پێغەمبەراندا هێناویەتی.**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ کاتێك ئامۆژگاری ئیمامی عەلی دەکات دەفەرموێت**(ثلاث يا علي لا تؤخرهن : الصلاة إذا آنت و الجنازة إذا حضرت و الأيم إذا وجدت كفؤا) المستدرك على الصحيحين/٢٦٨٦ وصححه الذهبي

**هاوەڵی بەرێزیش ئیبن مەسعود دەفەرموێت: بۆ دەوڵەمەندبوونتان هاوسەرگیری بکەن، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ النور: ٣٢






## (خۆشەویستی لە پێش هاوسەرگیری لە ئیسلامدا)

یەکێك لەو باسوخواسانەی کە ئەمڕۆ گەنجان تووشی بون، بریتیە لە تێکەڵبوونی کوڕان و کچان و هەواداربوونی یەکتر کە زۆرجار ئەو هەوداریە بەرەو سەرکەشی و دواتریش سەرکێشییان دەبات، بەڵکو متمانەیەکی وا لای هەردوو ڕەگەز بەرامبەر بەیەکتر نەماوە.

بنەڕەتی خۆشەویستی لە ئیسلامدا بریتیە لە خۆشەویستی بۆ خوای گەورە، چونکە خۆشەویستی بۆ ئەوەی واتای تەواوی خۆی وەربگرێت دەبێت دوو مەرجی تیادا بێت:

یەکەم: کەماڵ: واتە بگاتە کۆتا پلەو لەوە زیاترو سەروتر نەبێت، ئەگەرنا مرۆڤەکان هەمیشە حەز بە چاکتر و بەرزتر و جوانتر دەکەن.

دووەم : بەردەوامی : واتە پچڕانی تیادا نەبێت، ئەگەر نا هەر پچڕانێك ئەگەری لەناوچوونی هەیە. ئەمەش بەڕەهایی تەنها لە خوادا کۆدەبێتەوە، چونکە خوای گەورە بێ کەموکورتیە، جگە لەوەش پچڕان لە پەیوەندیدا نیە، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴾ الحديد: ٤







هـــەر خۆشەویـــستیەکی تـــریش دەبێـــت لـــەپێناو خۆشەویـستی خـوادا بێـت، پێغەمبـەرت خۆشـدەوێت لەبـەر خوا، چونکە خـوای پێناساندویت، موسڵمانانت خۆشـدەوێ لەبـەرخوا، چونکە خـوا ئـەوانی خۆشـدەوێت و داوا لـە تۆش دەکات خۆشت بوێن ( أن يحب المرء لايحبه الا لله ). هـەر لـەم ڕوانگەشـــەوە ئافرەتێکـــت بـــۆ هاوســـەرگیری خۆشـــبوێت لەبـەرخوا، وەك لـە فەرموودەکـەدا ئامـاژەی پێکـراوە: ( تـنكح المرأة لأربع، لمالها ولجمالها ولحسبها ولـدينها فاظفره بـذات الدين تربت يداك ) (متفق عليه) ئەمە بۆ ئافرتـانیش بەهـەمان شێوەیە.

دەشێت ئـەو پرسـیارە بێتـەڕێ کـە کەسێك دڵـی دەچێتە ســەر ڕەگـــەزی بەرامبـــەر و خۆشـــی دەوێـــت، ئەگەرچـــی پەیوەسـت بـە ئـایین نیـە، ئایـا دەبێـت هەڵوێـستی چـی بێـت؟ دەستبەرداری بێت ؟ یان درێژە بە خۆشەویستیەکەی بدات؟.







**سەرەتا خوای گەورە پێشنیارێك دەخاتە بەردەست کە کۆیلەیەکی موسڵمان لەبێباوەڕێك زۆر باشترە ئەگەرچی سەرسامی کردبێت:** ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُواْ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُوْلَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾البقرة: ٢٢١

**پاشان ئەگەر هەر خۆشەویستیەکە بەسەرتدا زاڵبوو، هەوڵدەدەیت کەسەکە بەرەو چاکە و ڕێنمونی بێنیت وەك چۆن نمونەی هاوەڵان لەو بارەیەوە هەیە کە ئافرەتەکە مەرجی موسڵمانبوونی ڕاستی لەسەر دانا، ئەگەر موسڵمان نەبوو، وەك ئەوەی کە مەسیحی یان جولەکە یان خاوەن ئایینێکی تری ئاسمانی بێت؟ ئەوا ئەگەر ئافرەتەکە ناموسڵمانبوو ئیسلام ڕێدەدات بە هاوسەرگیری بەم مەرجانە:**

**١- داوێنپاك بێت.**

**٢- پۆشتە بێت.**

**٣- سوکایەتی بە ئیسلام نەکات.**

**٤- منداڵەکە لەسەر بنەمای ئایینی خۆی پەروەردە نەکات.**







ئەم کارەش لەپێناو دوو مەبەستدایە:

١- بەڵکو ئەو ئافرەتە موسڵمان ببێت چونکە ئافرەت لەژێر کاریگەری پیاواندان.

٢- تا ئەو خۆشەویستیە بگاتە ئەنجام.

بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە موسڵمان بووو کوڕەکە ناموسڵمان بوو، ئەوا بە هیچ شێوەیەك دروست نیە بگەن بەیەکتر مەگەر کوڕەکە موسڵمان بێت، چونکە واهاتووە کە ئافرەتان لەژێر کاریگەری پیاواندان.

سەبارەت بە کوڕ و کچێکی موسڵمان کە یەکترییان خۆش دەوێت، بەڵام هێشتا لە قۆناغی پێش هاوسەرگیریدان، ئایا دروستە یان نا؟

وەڵام: فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)(لم نر للمتحابين شئ مثل النكاح) واتە: بۆ خۆشەویستی خێزان کوروکچێك هیچ چارەسەرێك وەك هاوسەرگیری بەباشتر نازانین، ئەمە بەڵگەی بوونی خۆشەویستیە لەمەیداندا، چارەسەریش تەنها هاوسەرگیریە، بەڵام تا ئەو کاتەی هاوسەرگیری دێت،دروستە یەکتریان خۆش بوێت بە مەرجێك تەنها خۆشەیستیەکەیان لەدڵدا بێت و نەگاتە ئاستی بەشداربوونی چاو وەك نەزەر یان گوێ وەك بیستنی قسەی ناپەسەند یان دەم وەك قسەگۆڕینەوە یان دەست وەك دەستبەریەکدان یان هەر







**پێناویکی تری لەوجۆرە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو فەرموودەی پێغەمبەر** (ﷺ) **کە ئاماژە بەوە دەدات مرۆڤ لەسەر ئەوەی بەدەروونندا دەگوزەرێت لێی ناپێچرێتەوە تا ئەوەی نەیڵێت:** (**إن الله تعالى تجاوز عن أمتي كل شيء حدثت به أنفسها ما لم تكلم به أو تعمل**) رواه النسائي و قال الشيخ الألباني: صحيح .

**یان بە قیاس لەسەر ئایەتی قورئانی پیرۆز:** ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾البقرة:٢٣٥

**دەكرێت یەكتریان خۆش بوێت بەڵام بەومەرجە توندوتۆڵەی ئیسلام. سەبارەت بە رۆڵی دایكوباوكو بنەماڵەش، چاكترین ڕێگەیەك لەوبارەدا بیگرنەبەر كاتێك كوڕ و كچەكانیان عاشق دەبن، ئامۆژگاری پێغەمبەر** (ﷺ) **ئەوەیە كە لەسەر دوو بنەمای ئاییندارى و ڕەوشت و ئەخلاق بەزووترین كات لەیەكتر مارەیان ببڕن، چونكە هیچ چارەسەرێك لەوە باشتر نیە، گرتنەبەری هەر هەنگاوێكی تریش پێچەوانەی داواوخواستی خواو پێغەمبەرەكەیەتی. چونكە دەبێت ئەو بزانین پێناوە جۆربەجۆرەكانی تر زۆرن تا ئەو دوو لاوە موسڵمانە بەرەو چەندین كاری خراپ ببەن.**







ئامۆژگاری و چارەسەرێکی تری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کور و کچەکە لەو قۆناغەدا بریتیە لە ڕۆژووگرتن، چونکە پارێزەری چاو و داوێنی ئەو کەسەیە، واتە تا چەندە دەتوانن با لەماوەی پێش هاوسەرگیریدا بە ڕۆژووبن، لەگەڵ ئەمەشدا تا دەتوانن تاوبدەنە یاد و پەرستشی خوای گەورە چونکە ئارامش بۆ دڵ و دەروونەکان دێنێت ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨ جگە لەمەش با هەوڵبدەن خۆیان لەو پێناوانە بپارێزن کە پاڵیان پێوەدەنێن تا بەدەر لەدڵ بەشداری پێبکەن، واتە ڕێگە بەو پێناوانە نەدەن بەوەی دەستوچاو و دەموگوێ بێننە مەیدانی خۆشەویستیەکەوە.

ئەگەر خۆشەویستیەك با تەنها لە دلیشدا بێت ببێتەمایەی کەمتەرخەمی لە ئایینەکەدا یان لە ئەرکە واجبەکاندا وەك زانستخوازی یان هەر ڕێگەیەکی تری شەرعی، ئەوا دەبێت یان خێرا بە هاوسەرگیری چارەسەری بکەیت یان خێرا خۆتی لێ دەرباز بکەیت، چونکە تۆ لەبەردەم دوو قوربانیدایت، قوربانیدان بە داهاتووی ژیانی دنیا و دوارۆژت یان قوربانیدان بە خۆشەویستی لە قالبی تاکێکدا کە جگە لەویش دەکرێت ببێت.






بەرپرسیارێتی بەر بارەگای خوا دەخەینە سەرشانی هەر کەیك بچوکترین تێگەشتنی جگە لەمە بدەنە پاڵ ئەم وتە و هەر کەسیش چاك دەزانێت لەگەڵ خۆی راست دەڵێت یان نا﴿ بَلِ الْإِنسَانُ عَلَىٰ نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ (١٤) وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُ (١٥) ﴾ القيامة: ١٥

## (هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان)

خالی بنەرەتی و کارای هاوسەرگیری بریتیە لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان ئایا کور بێت یان کچ، چونکە ژیانی هەرکام پەیوەستە بەو قۆناغەوە.

زۆرجار ئەو گلەیی و گازەندەیە لە نێو گەنجاندا دەبیستینەوە کە هەڵبژاردنی هاوسەر بۆ کوران کارێکی ئاسانەو بەویستی خۆیان دەگەڕێن و کەسی جێخواستی خۆیان هەڵدەبژرێن، بەڵام ئافرەتان دەبێت وەك مەڕ چاوەڕوانی قەساب بکەن تا بێت و هەڵیانبژێرێت.

ئەم گلەییە لە دوو لایەنەوە وەڵام دەدرێتەوە:

١- لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە شێوەیەکی سروشتی هەروا هاتووە کە ئافرەتان زۆر بە دەگمەن دەستپێشخەرییان کردووە و هەردەم کوڕان هەنگاوی یەکەمیان ناوە، ئەمە پەوەست بە کۆمەڵگا یان ئایین یان ناوچەیەکی دیاریکراو نیە، بەڵکو لەجیهاندا وابووە.







٢- لە ئیسلامدا بەبێ هیچ دوودڵییەك ڕێگە بەوە دراوە کە ئافرەتان هەنگاوی یەکەم بنێن، هەر کچێك کە کوڕێکی بەدڵە لەوەدا مافی هەیە بەهەر ڕێگەیەك بێت هەنگاوی یەکەم بنێت، بەڵام ئەوە خودی ئافرەتانن ئەوەیان لەسەر سەختە، چونکە لەگەڵ مێژووی پێشویاندا جیاوازە.

ئەگەر بڕوانینە ڕای زانایان لەبارەی ڕووداوەکەی پێغەمبەر مووسا کاتێك یارمەتی دووکچەکە دەدات، پێشنیاری کچەکە بۆ باوکی ئەوەبوو کە با ئەو کوڕە لەدەست نەچێت و یارمەتیمان بدات، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە ئەو کچە هەنگاوی یەکەمی ناوە تا پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ مووسا پێشنیار بکات. پاشان نمونەی دایکمان خەدیجە کە پێشنیاری هاوسەرگیری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کرد، جگە لەمەش نمونەی تر هەیە کە ئافرەت هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر و ئەو پێشنیارەی بۆ کردووە، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) پێشنیارەکەی پێ باش نەبووە و ئافرەتەکەش لای ئاسایی بووە.

بۆیە پێویستە ئافرەتان ئەوە لەبیر نەکەن کە پێشنیاری هاوسەرگیری مافی ئەوانیشە، بەڵام لەبەر پارستنی شانوشکۆی خۆیان بائاگاداری ئەو ڕەوشە کۆمەڵایەتیە بن کە بەسەر کۆمەڵگادا سەپاوە و هەندێکی لە ڕێنماییەکانی







شەریعەتی ئیسلام دووره. ئەگەرنا لە ڕەوشێکی سەختی وەك ئەمڕۆدا کە کوڕانی گەنجی باوەڕدار و ڕاستگۆ ڕوو لەکەمین و ئافرەتانیش بەرەو ڕووی شاڵاوی توندی ڕەوشتی بوونەتەوە، ئافرەتی پەیوەست و باوەڕدار زۆر هەڵوێستی باش و شەرعی و ژیرانەشی دەبێت ئەگەر کوڕێك هەڵبژێرێت کە لە ئیمانی دڵنیا بێت تا ئیمانەکەی ئەویش بپارێزێت. ئەمە لەبەرچاوگرتنی داهاتوو و هەوڵی پاراستنی ئیمانە نەوەك چەمکی (بێئابڕوویی)، چونکە سەختە ئافرەتێکی باوەردارِ و دامەزراو تووشی کورێکی دانەمەزراو بێت و وەك خۆی بمێنێتەوە، نمونەش لەوبارەیەوە زۆرن، بەڵام باشتر وایە ئەو ئافرەتە ڕاستەوخۆ خۆی بە کوڕەکە نەڵێت لەبەرئەوەی:

١- ئەگەر بە تەنها پێی بڵێت ئەوا هەرگیز شەرعی نیە و تەنهایی بۆ هیچ مەبەستێك لە نێوان کوڕ و کچێکی نامەحرەم بەیەکتر دروست نیە و هەر بیانوویەکیش لەبەردەم شەریعەتدا قبوڵ نیە.

٢- ئەگەر لەگەڵ کەسێکی تریشدا پێی بڵێت، یان دەکرێت کوڕەکە تێگەیشتوو نەبێت و ئافرەتەکە بە کەم بزانێت، یان دەکرێت کوڕەکە تێگەیشتووبێت، بەڵام پێی باش نەبێت، ئەو کات کچەکە هەست بەکەمی دەکات، چونکە






ئەمە بۆ ئافرەتان سەختە و وەك كوڕان نیە، بەڵكو چاكتر وایە لەڕێگای یەكێكی ترەوە هەنگاو بگرێتەبەر، وەك چۆن نمونەی پێغەمبەر موسا ئافرەتەكە لەرێگەی باوكیەوە هەنگاوی نا، یان دایكمان خەدیجە لەرێگەی كەسانی ترەوە هەنگاوی نا.

كوڕانیش با هەڵە لە هەنگاوی ئافرەتانی وا تێنەگەن و بزانن خوا ئەو مافەی بەوانیش داوە وەك چۆن بە كوڕانی داوە و هیچ جیاوازییەك نیە، بەڵكو ئەوە كۆمەڵگەو پاشان سروشتی گشتی خودی ئافرەتانە كە ئەو مافەی لێ زەوت كردون.

ئەوەی زیاتر لە جیهان بە گشتی و لە ڕۆژهەلاتدا بە تایبەتی باوە ئەوەیە كە كوڕان پێشڕەوی دەكەن تا هاوسەری ژیانیان هەڵبژێرن، لە ئیسلامدا سنوور بۆ ئەو هەڵبژاردنە دانراوە، دەبێت ئافرەتێك بێت كە سێ مەرجی تیادا بێت:

١) ڕەوشتپاك بێت.

٢) هاوسەری نەبێت، سوپاس بۆ خوا ئەم شێوە لە كۆمەڵگەماندا بوونی نیە كە ئافرەتێك دوو هاوسەری هەبێت.



**٣) خاوەنی ئایین بێت، ئیتر ئایینی ئیسلام بێت زۆر باشترە، ئەگەر نا رێگە بەوە دەدرێت ئافرەتێك لە ئایینەکانی تر بهێنێت بەڵام بەپێی ئەو مەرجانەی کە پێشتر باسمانکردن.**

**لەگەڵ ئەوەشدا باشتر وایە کور بۆ هاوسەری ژیانی ئافرەتێك هەڵبژێرێت کە سیفەتگەلێکی جوانی تیادا بێت، وەك: لەخواترسی زۆر بیت، جوانی روخساری هێندە بیت دڵی کورەکە ڕابگرێت، گوێرایەڵ و تێگەیشتوو بێت، نەرمونیان بێت و سیفەتی نەرمی مێینەی لەدەست نەدابێت، بڕوبیانوگر نەبێت، خۆسەپێن و پەککەوتە و بێمەیل و مۆنومرچ نەبێت، بەڵام ئەوە بزانین کە ئەمانە مەرجی شەرعی نین. هەروەها بۆ کوڕان واباشترە و سوننەتە ئافرەتێك بهێنن کە مندالی بێت واتە نەزۆك نەبێت، هەروەها کچ بهێنن نەوەك بێوەژن، وەك کاتێك هاوەلی بەرێز (جابر) بیوەژنێکی بەهاوسەر گرت، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (( ألا تزوجتها بکرا تلاعبك و تلاعبها و تضحکك وتضلحکها)) با کچێکت بهێنایە باشتربوو تا پێکەوە گاڵتەوگەپ و بزە و خەندەتان هەبێت. جگە لەوە باوکان و براو مامو کەسان دەتوانن ئەگەر کورێکی باشیان بەدیکرد، پاش ڕەزامەندی کچەکە پێشنیاری هاوسەرگیری ئەو کچە بۆ کوڕەکە بکەن یان بە پێچەوانەوە، لەو بارەشەوە نمونەی زۆر**






لەنێو هاوەڵان و دواتر مێژووی ئیسلامیدا هەیە. بەڵام نابێت زۆرو فشاری تێدابێت. چونکە ئەو کات دروست نیە و زۆرلێکردنیش شکاندنی مافی ئافرەتە و لادان لە فرمانی خوایە و ئەو کەسەی فشار بەکاردێنێت بابزانێت بەرامبەر بە بڕیار و خواستی خوا وەستاوە.

## ئایا بۆ هاوسەرگیری لە نێوخزماندا هەنگاو بنرێت چۆنە ؟

فەرموودەیەکی لاوازی پێغەمبەرﷺ هەیە کەئاماژە بەوە دەکات هاوسەرگیری لە خزمان نەکرێت باشە، بەڵکو تابکرێت لە دەرەوەی خزماندا بێت، چونکە نرخی هەردوولا زیاتر دەکات و پەیوەندی کۆمەڵایەتیش فراوان دەبێت و لە ڕووی زانستیەوە دڵنیایی زیاترە.

بەڵام لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دەبینین هاوسەرگیری نێوان خزمان زۆربووە و پێغەمبەریش ﷺ خۆی ئەنجامیداوە و لای ئاسایی بووە، بۆ نمونە هاوسەرگیری ئیمامی عەلی و فاتیمە(ڕەزای خوا لەهەردوکیان)، دەبینین عەلی ماوەیەکی زۆر لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) ژیاوە و لەوێ گەورە بووە، دواتریش دەچێتە داوای






فاتیمـەی کـچی پێغەمبـەرو پێغەمبـەریشﷺ رازی دەبێـت و هـیچ هەڵـە تێگەشـتنێکی بەرامبـەر بـە عەلـی نابێـت. بـەڵکو کاتێـك کەمدەسـتی دارایـی عـەلی دەبینێـت، کارەکـەی لەسـەر ئاسان دەکات، جا هەر گومانکردن و دڵپیسیەك لەوبارەیەوە کـە لــە کۆمەڵگــەدا بــاوە لەگــەڵ ســوننەتی پێغەمبــەر یەکناگرێتـەوە، بۆیـە لـە ئیسلامدا هـەردوو دەرفەتەکـە هـەن، ئەگـەر لـە دەرەوەی خزمانـدا هاوسـەرگیری بکرێـت، شـتێکی زۆر بـاش و زانستیـشە، ئەگـەریش لـەناو خزمانـدا بکرێـت کــارێکی شــەرعیە و نمونــەی پێغەمبــەرﷺ و هاوەڵــانی لەسـەرە، بـەڵام پێویـستە ئاگـاداری پـشکنینی پزیـشکی بـن، هـەتا سـتەم لـە خۆیـان و لـە منـداڵی داهـاتووی ژیانیـشیان نەکەن.

## ئایــا هێنــانی ئــافرەتی ناپــاڵاپۆش یــان کــوڕی ناپەیوەست بە ئایین ڕەوایە؟

زۆرێك لە کوڕان دەڵێن با کچێکی بێ لەچك بهێنین و دواتــر دەیکەینــە بــاڵاپۆش، کەچــی ئەگــەر ســەیر بکــەیت دەبیینت لەناو بێ لەچکەکاندا جوانەکان هەڵدەبژێرن، واتـە مەبەسـتەکەیان جوانیەکەیـە، نـەوەك هێنانیـان بـەرەو ڕێــی ڕاست.






لە ئیسلامدا دروست نیە ئافرەتی ناپاڵاپۆش بە هاوسەر بگریت، مەگەر پێش هاوسەرگیری مەرجی باڵاپۆشی لەسەر دابنێیت و جێبەجێشی بکات، ئەو کات دروستە. سەبارەت بە کوڕی ناپەیوەست بە ئیسلام، بە هیچ شیوەیەك دروست نیە مەگەر پێش هاوسەرگیری مەرجی پەیوەستبوون بە ئیسلامی لەسەر دابنێیت و جێبەجێشی بکات، نمونەی ناو هاوەڵانیش هەیە.

سەبارەت بە سیفەتی باڵاپۆشی دەتوانن بگەرێنەوە بۆ سەرچاوەکانی شەریعەت، بەڵام پوختەکەی ئەوەیە بەرگێکی پان و ئەستوور و دوور لە سەرنجراکێشی بێت و جەستە دابپۆشێت و لە کەمترین و ئاسانترین رێپێدراندا تەنها دروستە دەست و دەموچاو دەربکەوێت.

سەبارەت بە پەیوەستبوونی کوران بەهەمان شێوە پێویستی بە خوێندنەوەی ناو شەریعەت هەیە و پێویستە پرسیار لە زانایان بکەن، بەڵام بە کورتی بڕوای بە شەش پایەکەی ئیمان هەبێت و شایەتومانی هێنابێت و رۆژوو و نوێژەکانی هەبێت و ئەگەریش بتوانێت حەج بکات، هەروەها دژی هیچ بەشێکی ئیسلام نەبێت و یاریدەدەر و هەواداری دوژمنانی ئیسلام نەبێت و بەهەموو ئیسلام ڕازی بێت.



# ( ئامانج و ئەنجامەکانی هاوسەرگیری )

وەك پێشتر وتمان ئاییینی ئیسلام گرنگی زۆر بە هاوسەرگیری دەدات، بۆ ئەمەش دەیگەیەنێتە ئاستێك كە هاوسەرگیری دەكاتە واجب و پێویستی سەرشانی موسڵمان، هەر ئەركێك لە ئیسلامدا لەسەر بنەمای ئامانجێكە بۆ بەدیهێنانی ئەنجام یان چەند ئەنجامێك، واتە لە ئیسلامدا هیچ شتێك بەبێ ئامانج نیەو هەر بەچاكە دانراوێك ئەنجامی چاكیشی دەبێت.

دەكرێت ئەنجام و ئامانجەكانی هاوسەرگیری لە ئیسلامدا تێكەڵ بەیەكتر بكەین، چونكە تا ئاستێكی زۆر هەموو ئەو ئامانجانەی ئیسلام دایاندەنێت دەبنە ئەنجامو بۆ ئەوە دەشێن ببنە ئەنجام، نەوەك هاوشێوەی كۆمەڵە ئامانجێك بێت، كە بوون بە ئەنجامیان مەحاڵ بێت.

بە كورتی گرنگترین ئامانج و ئەنجامەكانی هاوسەرگیری بریتین لە:

١- بە جێگەیاندنی فرمانی خوا: پێدەچێت لەم رووەوە زۆر گەنج بە بیستنی ئەم قسەیە سەری سووڕ بمێنێت و بڵێت ئەمە چیە هەر شتێك دەبرێتەوە ئەو قاڵبە؟ بەڵام با وردبینانە سەیربكەین، گەنجێكی خاوەن ئارەزوو و هەواداری






سەرکێشی ئەگەر بەهایەکی بالاّ نەیگرێتەوە دەبێت بۆچی خۆی لەیەکەمین چێژو ئارەزووی ژیان بگرێتەوە؟ گەنجی موسڵمانیش پێش هەموو شتێك بترسێتو هاوسەرگیری بکات تا خۆی لەهەر کارێکی خراپ بەدووربگرێت، ئەگەرنا وەك ڕۆژئاوا تێکشکاندنی بەها کۆمەلاّیەتتیەکان زۆر سەخت نیە.

٢-بەدەستهێنانی سوکنایی: مرۆڤ لەپێش هاوسەرگیریدا سوکنایی نیە، بەڵکو پشێوو ڕاراو دوودڵە، بەلاّم لەگەڵ هاوسەرگیریدا سوکنایی دێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت (لتسکنوا) واتە ئامانجێکی هاوسەرگیری سوکناییەو بە ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری دێتەدی.ئێمەش دەزانین مرۆڤیش بۆ بەختەوەری و کارا بوونی پێویستی بەسوکنایی هەیە.

٣-پاراستنی ئیمان: پێشتر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)مان ئاماژە پێدا کە موسڵمانان بۆ هاوسەرگیری هاندەدات، چونکە زامنی پاراستنی نیوەی ئیمانە، ئەمە ئامانجێکی چاك و ئەنجامێکی گەورەیە، ئەگەر کەسانێك لەپێناو پاراستنی یان بەدەستهێنانی سامان یان پلەو پایەیەکدا خۆیان لە هاوسەرگیری بەدوور دەگرن، بابزانن بەوکارەیان گەورەترین سەرمایەو زامنی سەرمایەی ڕاستی






لەدەستدەدەن کە ئەویش ئیمانە،چونکە ئیمان گەورەترین سامانێکە کە دنیاو ڕۆژی دواییش دەگرێتەوە.

٤- پاراستنی ڕەگەزی مرۆیی: پێغەمبەر(ﷺ) لەداوایەکیدا بۆ ئوممەتەکەی داوا دەکات ئافرەتانێك بهێنن کە منداڵیان ببێت تا ژمارەی ئەندامانی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) زیادبکات، ئەو کۆمەڵگەی پێکهاتەی هاوسەرگیری تیایدا لاوازە، مەترسی زۆری لەسەر ڕەگەزی مرۆیی هەیە، چونکە مرۆڤەکان بە جووتبوون زیاد دەکەن و ڕێگەی ڕەوایش بۆ ئەوە هاوسەرگیرییە ئەگەر نا ئەو منداڵانەی بە زینا دێنەدنیا، وەلا دەنرێن و سۆزی دایكوباوكیان نابێت.

٥-پاراستنی بەها ڕەوشتیەکان: چونکە بەبێ هاوسەرگیری بەها ڕەوشتیەکان دادەڕمێن، بەڵکوو مرۆڤەکان بەها کۆمەڵایەتیەکانی خۆیان لەدەستدەدەن، چاکترین نموونەش ئەزموونی ئەمڕۆی ڕۆژئاوایە.

٦- دووربوون لە نەخۆشی: دیارە گەورەترین پێناوی دەرکەوتنی نەخۆشی ئایدز هەردوو لایەنی کاری جنسی هاوڕەگەزی و کاری زینایە، ئەم دوانەش لەنەبوونی ئاستی بەرزی هاوسەرگیرییەوەنچ١وونکە هیچ کات بەهۆی هاوسەرگیری شەرعیەوە نەخۆشی ئایدز بەرهەم نایەت، مەگەر ئەوەی کەسەکان پێشتر تووش بووبن.






٧- بەدەستهێنانی منداڵ: لەئیسلامدا منداڵ پایەیەکی بەرزی هەیە، بەڵکو منداڵ پێناوێکی گەورەیە تا دایكوباوكی بەرەو بەهەشت ببات، منداڵ پێناوێکی خێر و چاکەیە بۆ دایكوباوك لە پێش مردن و دوای مردنیشیان، یەكێك لەو پێناوانەی کردەوەی چاکی مرۆڤ دوای مردنی دەهێڵنەوە منداڵی صاڵحە، پێغەمبەر (ﷺ) کە باسی ئەوە دەکاتو دەفەرموێت ( ولد صالح یدعو لە ). ئەگەریش منداڵەکەی بمرێت دووبارە دەبێتە شەفاعەتکار بۆ دایكوباوکی و لە دۆزەخ دوریاندەخاتەوە وەك لە کتێبەکانی فەرمودەدا چەندین فەرموودەی لەسەر هاتووە.

٨- ماڵ پێکەوەنان: مرۆڤ هەمیشە حەزی بە خاوەندارێتیە، ئەمەش لەدوای هاوسەرگیری زۆر بەهێز دەبێت،ئەو دوو کەسە دەکەونە پێکەوەنانی ماڵ وخانوو دروستکردن، پاشان دەتوانن ئەو ماڵ و خانووە بکەنە پێگەیەك بۆ کارەکانی خۆیان، وەك:خوێندنگەیەك بۆ وانەوتنەوە، کتێبخانەیەك بۆ خوێندنەوە، لانکەیەك بۆ کەسانێکی بێنەوا، کۆبوونەوەیەك بۆ خزمان یان هاوکاران...هتد.

٩- دەوڵەمەندبوون: گەنجانی ئازیز ئەم قسەیە سادە نیە، ئەمە ئیشکردنە لەسەر بەڵێنێکی خوای گەورە کە دەفەرموێت ﴿ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ النور: ٣٢ واتە







**لەگـەڵ گرتنەبـەری هاوسـەرگیریدا دەوڵەمەنـدی و دابـارینی بەخششی خوای گەورەی بەدوادا دێت.**

**١٠- پەیـداکردنی هـاوەڵێکی گـشتگیرو بەردەوامـە: مـرۆڤ پێویستی بە هاوڕێیەکە تا بتواننێت لە زۆرترین لایەنەکانەوە لەگەڵیدا بێت و سوودی پێبگەیەنێت، ئەمانەتی بپارێزێت، دڵنەوایی بکات، یارمەتی بدات، دڵخۆشی بکات، هۆشیاری بکاتـەوە، خزمـەتی بکـات...هتـد، ئەمـەش تـەنها بـە هاوسـەرگیری دەکرێـت، چـونکە ژن ومێـرد لەبەرئـەوەی خـوا سۆز و میهر دەخاتە نێوانیان ئامادەن بۆ یەکتر بتوێنـەوە، هەر ئەم ئامادەبوونەو پاشان پێکەوەبوونە بەردەوامەو بوونی بەرژەوەندی هاوبەشیان وادەکات چاکترین هاوڕێی یەکتر بن.**







## قۆناغی هاوسەرگیری

باسی مەرج و ڕەوایی شێوەی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانمان کرد، پاشان قۆناغەکانی تری پێش هاوسەرگیری دێن، سەیرکردنی یەکتر پێش هاوسەرگیری دروستەو بەڵکو پێویستە، نەوەك تەنها بە وەصفکردن بێت، بەڵکو زانایان ڕاجیاوازن لەسەر شێوەی بینینەکە، هەموو لەسەرئەوە یەکدەنگن کەسێك بۆ هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان بۆی هەیە سێ جار بیبینێت و ناچێتە بواری نەزەرەوە، بەڵام هێنانی ژن بەبێ بینینی، لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نەهی لێکراوە، لەفەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و وتی کە ئافرەتێکی ئەنصاری هێناوە، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێکرد کە بینیویەتی؟ ئەویش وتی نەمبینیوە، پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی پێکرد بڕوات و بیبینێت، بەهەمان شێوە نموونەی تریشمان هەیە کەکەسێك هاتووەو پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی پێکردووە بیبینێت.

سەبارەت بە شوێنەکانی جەستە بۆ بینین زانایان ڕاجیاوازن لەمپەڕەوە تا ئەوپەڕ، هەندێك دەڵێن تەنها بینینی دەست ودەموچاوە، هەشە دەڵێت زۆربەی جەستەی یەکتری ببینن،







**هەندێکی تریش دەڵێن بڕوانیتە ئەو شوێنانەی کە بەلای تۆوە گرنگن، واتە لای کەسەکە کام شوێنانە هەستیارو گرنگن بەبەرگەوە بۆی بڕوانن، دەشکرێت بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی جەستەی کەسەکە هاوڕەگەزێکی ڕاسپێردرێت بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی ئیمامی حاکم لە کتێبی المستدرك بە ژمارە٣٢٤٥هێناویەتی کە پێغەمبەرﷺ وەسفی ئەبوجەهمو موعاویەی بۆ ئافرەتێکی خوازراو لەلایەن ئەو دوانەوە کردووە، ئیمامی ئەلبانیش بە صەحیحی داناوە، یان بۆ چەند بوارێکی تایبەت پشکنینی پزیشکی بۆ بکرێت.**

**پاش یەکتر بینین و ڕەزامەندی هەردوولا، پێویستە پشکنینی پزیشکی لەبیر نەکرێت چونکە پێغەمبەر (ﷺ)فرمانیداوە تا لەچەند نەخۆشییەك ڕابکەین، وەك دەفەرموێت (فروا من المجذوم فراركم من الأسد)**مصنف عبدالرزاق. **ئەمەو چەندین فەرموودەی تر دەبنە بەڵگەی پێویستی پشکنینی پزیشکی بەپێی ئاستی زانستی پزیشکی ئەو کاتەو ڕەوابوونی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا، بۆ ئەوەی هەردوولا دڵنیا بن و منداڵی داهاتووشیان پارێزراو بێت، چونکە منداڵیش مافی لەسەر دایك وباوك هەیە، بەدەر لەوەی جەستە مافی لەسەر کەسەکان هەیە، هاوکات بە پشکنین دەکرێت نە خۆشییەك کە هەبێت دیاری**






بکرێت و چارەسەریش بکرێت، ئەوە باشترە تا ئەوەی دواتر گیرۆدە بن، جگە لەوەش بۆ ئەوەی دڵنیا بن لە کچێتی ئەو ئافرەتەو دواتر ئەگەر خوێن لە ئافرەتەکە نەهات پیاوەکە گومان نەکات، چونکە هەندێ ئافرەت پەردەی کچێنییان خوێنی لێنایەت، هەروەها تا ئەگەر پیاوەکە دواتر بەرامبەر بە ئافرەتەکە ڕقی هەڵگرت نەتوانێت بوختانی لەڕوودا بکات، مامۆستا خالد عبدالرحمن العك بەجوانی ئەمەی خستوەتە بەرچاو.پاشان ئەگەر بتەوێت بچیتە داوای کچێك، دەبێت بزانیت کەسیتر لەوکاتەدا نەچوەتە داوای، چونکە دروست نیە کەسێك بچێت بەسەر داوای براکەیدا وەك لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ)هاتووە (لا يخطب الرجل على خطبة أخيه حتى ينكح أو يترك ) رواه: البخاری ومسلم والنسائی و ابن حبان و أحمد یان دەبێت مۆڵەت لە داخوازیکەرەکە وەربگرێت وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت( لا يخطب الرجل على خطبة أخيه حتى يترك الخاطب الأول أو يأذن له فيخطب )رواه ابن حبان و قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط البخاري

ئەمە بۆئافرەتانیش وایە، بەڵام لێرە زۆر دەگمەنە ئافرەت دەستپێشخەر بێت، ئەوەی لەم فەرمودەوە ئافرەتان دەگرێتەوە ئەوەیە هەوڵدەدەن داخوازی کوڕێك بۆکچێك تێکبدەن لەپێناو داوای خۆیان، یان حەسودی پێبردنی و



**تێکدانی دروست نیە، چونکە ئەمەش هەمان چوارچێوەی هەیە.**

**پاشان بۆ ڕاڕازیکردنی دڵی کچەکە یان کەسوکاری دروست نیە بچێتە لای فاڵچی و قاوەگر، ئەگەر دڵی ئەوکەسەت بۆڕازی دەکات، ئەوا دڵی خوات لێدەڕەنجێنێت، چونکە ئەوە حەڕامەو هاوەڵدانانە بۆ خوا، گەنجی موسڵمان: بزانە ئەو کارەی ئەو فاڵچی و بەناو شێخانە دەیکەن تەنهاو تەنها بەهاوکاری شەیتانە و ڕەنجاندنی خوایە.**

**پاشان چاك وایە پێش هەر هەنگاوێك نوێژی ئیستخارە بکرێت، چونکە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) ی لەسەرە و مایەی خێرە لەو کارەدا.**

**دوای ئەوەی دەچێتە داوای کچەکە یان بە پێچەوانەوە دەبێت پرس بکرێت، بێدەنگی کچ بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) واتە ڕازیبوون، چونکە واباوە کە کچ شەرم دەکات، ئینجا با کەسی هەڵبژێردراویش نوێژی ئیستخارە بکات.**

**دواتر دەکرێت بە ئامادەبوونی کەسی مەحرەم پێکەوە دابنیشن و قسەی خۆیان بکەن، تا لەیەکتر تێبگەن نەوەك دواتر گرفتیان بۆ دروستبکات، لێرەدا کەسی خوازراو هەمیشە تووشی دوودڵی دەبێت و بە گومانەوە دەڕوانێتە**







**کارەکە، لەگەڵ ئەوەی پێویستە بیری لێبکاتەوە، بەڵام دەبێت بیری بێت زۆربەی گومانەکان لە شەیتانەوەن، بەڵکو با جەخت لەسەر خاڵە بنەڕەتی و پێویستیەکان بکاتەوە و هەرکامەو دەبێت چەند مەرج و بەرژەوندیەکی شەخصی خۆیان لە پێناو ئەویتردا وەلابنێت، ئەگەرنا هیچکەس نەگەشتوەتە پلەی کەمالٌ و هەرکامەو لە شتێکدا فەزڵیان بەسەر ئەویتریاندا هەیە، وەك خوا دەفەرموێت** ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾﴾ النساء

**نابێت لەقسەکردنیاندا بەتەنها بن و هیچ بیانوویەکیش بۆ ئەوەنیە، ئەوان پرۆسەیەك لەبەرچاوی جیهاندا پەیڕەو دەکەن، ئیتر چۆن دەبێت کرۆکی بابەتەکە بەنهێنی قسەی لەسەر بکرێت، بەلاًم با ئەو کەسەی لە نێوەندایە لەگەڵ کەسی بۆ بەمەحرەمبوونەکەیدا کەسی جێی متمانەو ڕاستگۆو دڵسۆزوو تێگەیشتووبێت.**

**پاشان ئەگەر ڕەزامەندی هەردوولای لەسەربوو، ئەوکات مارەبڕین دێتە باسەوە، لە مارەبڕینیشدا دەبێت مارەیی هەبێت و بەرپرسی ئافرەتەکە ئامادەبێت، پاشان ڕەزامەندی**






**کچەکەو ئامادەبوونی دوو شایەت و دواتریش دەربڕینی ئەو مارەبڕینە بەدەم وئاشکراکردنی، سەبارەت بە وردەکاری لەمبارەیەوە بگەڕێنەوە بۆ کتێبەکانی شەریعەت وەك کتێبەکانی (فقه السنه) کە سەید سابق نوسیویەتی و کراویشە بە کوردی.**

**لە مارەییدا دیاری نەکراوە چەند بێت، بەڵام باشتر وایە زۆر نەبێت و زیادەڕۆیی تێدا نەکرێت، بەڵکوو ئاسانکاری کردن کارێکی سوننەت و جێڕەزامەندی خوایە، ئەو مارەییەش تەنها مافی ئافرەتەکەیەو دایك وباوك و خزمانیان مافیان تیایدا نییە.**

## ئایا بۆ ئافرەت دروستە بەبێ مۆڵەتی باوکی شوو بکات؟

**دەبێت بۆ شوکردنی ئافرەت باوك ڕازی بێت و ئەمەش مەرجە، بەڵام هەندێ لە زانایان ڕێگەیان داوە ئەگەر باوکەکە لەوکارەیدا سەرکەشی و لاساری نواند ئەو کات بۆ ئافرەتەکە دروستە بەبێ مۆڵەتی باوکی شووبکات، یان ئەگەر باوکی موسڵمان نەبوو و ویستی بیدات بە ناموسڵمان، ئەو کاتیش لادان لە فرمانی باوکی دروستە، باوکانیش بیریان بێت گوناهبار دەبن ئەگەر ئەو مافە بقۆزنەوەو ستەم لە**






**کچەکانیان بکەن و تەنها مەرجی ئیمان و ڕەوشت لەبەرچاو بگرن، ئەگەرنا خراپەکاری دەکەن، ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری خوایەو دەفەرمویت(إذا أتاكم من ترضون خلقه و دينه فانكحوه ألا تفعلوا تكن فتنة في الأرض و فساد عريض)**
المستدرك على الصحيحين/٢٦٩٥

**پاشان بزانن ئەگەر زۆر لەسر ئەو کارەیان بڕۆن و لاساری بنوێنن زانایانێك مۆڵەتیان بەو کچە داوە تا بێ مۆڵەتی باوکی شوو بکات، جگە لەوە چاکترین چارەسەر بۆ دوو خۆشەویست هاوسەرگیریە وەك پێشتر ئاماژەمان بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) داوە، لە مارەبڕینەکەدا دروست نیە هیچکام خۆیان بەغەیرە موسڵمان بچوێنن و هیچیش پێویست ناکات، کوڕ دەبێت خۆی لە ئەڵقەی زێڕ بەدووربگرێت و ئەڵقەی زیو دروستەو لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دا لەناو هاوەڵاندا ئەڵقەی زیو بەکار هێنراوە، هەڵەیەکی گەورەش هەیە گەنجی موسڵمانان بۆ ئەو کارە سیفەتە ئیسلامیەکانی وەك ڕیش وبەرگی ولەچك وبالاّ پۆشی و ... هتد لەخۆی دادەماڵێت، بەڵکوو با سەرەتای کاری خێرتان لادان نەبێت لە فرمان و خواستی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە بڕیارە خوای گەورە خۆشەویستی و**






فەزڵ و دەوڵەمەنددیتان پێببەخشێت، نەوەك چاوی خەڵك و قسەو قسەڵۆكی ئەملاو ئەولا.

لەو ماوەشدا چوونە دەرەوەی ئەو كوڕو كچە چاك نیە وەك ئەوەی ئەمڕۆ لەكۆمەڵگەی ئیسلامیدا باوە، چونكە سەد ئەگەری خراپ لەو نێوەندەدا هەیە، بۆیشیان نیە پێش گواستنەوە جووتبن، بەڵكو ئەمە تەنها هەنگاوی یەكەمی هاوسەرگیرییەو چاك وایە وریای ئەو قۆناغە بن كە هەستیارترین قۆناغە.

## گواستنەوەو شەوی زاوایی و بوكێنی :

پاشان قۆناغی گواستنەوە دێت و سوننەتە بۆ گواستنەوەكە ئاهەنگ و خۆشی بگێڕدرێت و بانگهێشت بكرێت و تیایدا گۆرانی ڕەوا بوترێت بەڵام دەبێت ئاهەنگەكە بە پێی خواستی شەریعەت بێت، بەكورتی لە سوونەتدا بەمجۆرە هاتووە:

١-ئاهەنگ بكرێت و خەڵكی بانگ بكرێت.

٢- سوننەت وایە لە مزگەوتدا بكرێت، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ هۆڵەكان بوونەتە شوێنی ئەوەو مزگەوتەكان لە كۆمەڵگە دوورخراونەتەوە، هەركەسیش ئەوە بكات جگە لەوەی سەركۆنە دەكرێت ڕێیشی لێدەگیرێت.







**٣-بە هیچ جۆرێك درووست نیە کچان و کوڕان یان ژنان و پیاوان تێکەڵ بکرێن، وەك ئەوەی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بڵاوبوەتەوەو فرمانی خواو پێغەمبەرەکەی وەلانراوە.**

**٤-هەر جۆرە گۆرانیەك دەوترێت سوننەتە مادەم لە شەرعی خودا لانەدات، واتە گۆرانیەکە قسەی خراپی تێدا نەبێت و بەرەو خراپەیان نەبات و لەفەرموودەدا هاتووە تا دەف لێبدرێت، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) داوای کردووە لەو ئاهەنگانەدا گۆرانی حەلاڵ بوترێت، وەك ئەو دێڕە شیعرەی کە هاتووە( اتیناکم اتیناکم...) بەلاّم سەبارەت بە بەکارهێنانی مۆسیقا لە ئاهەنگەکەدا زانایان لەسەر حەلاڵی مۆسیقا ڕاجیاوازن، زۆرینەیان پێیان حەڕامەو دەڵێن نابێت بەکاربێت، هەندێکیش بە حەلاڵی دەزانن بەمەرجێك بەمەبەست و شێوازی خراپ بەکارنەیەت، ئەمەش کۆتا مۆڵەتی ڕای زانایانێکە.**

**٥- سەبارەت بە وێنەگرتن و بوارەکانی دەبێت هەردوو ڕەگەزی نێروو مێ جیابن و دروستیش نییە هیچ وێنەیەکی گیراو یان ڤیدیۆیی ئافرەتەکان بەرچاوی پیاوان بکەوێت، بەڵکو دەبێت زۆر وریای ئەوە بین پێشکەوتنی ژیان ئایینەکەمان وەلا نەنێت.**






٦- هەریەك لە بووك وزاوا زۆر بە ڕێكوپێكی بڕازێنرێنەوە بەو پێیەی شەریعەت داوای كردووە، بەجۆرێك نموونەی بالای جوانی و ڕازاوەیی و خۆشحالی بن.

٧- ئەو شێوەی ئەمڕۆ باوە كە بووك وزاوا ببرێنە هۆلی ڕازاندنەوە لەمجۆرەی باوی ئەمڕۆدا زانایان بە حەرامی دەزانن، بەڵكو دەبێت بە ڕێگەی شەرعی بێت، بۆ وردەكاریش لەمبارەیەوە بڕواننە سەرچاوەكانی شەریعەت، بەكورتی دروستە بڕازێنرێنەوە، بەلام نەوەك كوڕو كچ یان بە پێچەوانەوە، پاشان خەسڵەتە شەرعیەكان ڕەچاو بكرێن.

پاشان بووك وزاوا دەچنە كەژاوەی هاوسەرییەو دەبێت وریای ئوتێلەكان بن، چونكە ناپاكی زۆریان تێدا ئەنجام دەدرێت كە زۆرجار لەسەر بنەمای ئابڕووبردنە، بۆیە باشتر وایە لەماڵ و شوێنێكی دڵنیاو ئارامدا بن.

سەرەتا دوو ڕكاتی سوننەت بكەن و نزای خێر بكەن، پاشان پیاوەكە دەستدەخاتە سەر سەری ژنەكەو نزای خێر دەكات، ئینجا بەرەبەرە دەبێت شەرمی یەكتر بشكێنن و بە ماچكردن و دەستلێدان و قسەی شیرین یەكتر ڕابێنن.

ئەوەی لێرەدا گرنگە پەلەنەكردنە بەتایبەت لەلایەن پیاوەوە، چونكە بەگشتی ئافرەتان ترسی زۆریان لەوشەوە هەیە وخراپ وێنایان لاكراوە، بۆیە با كوڕەكە دەروونی بووك







**لەبەرچـــاو بگرێـــت و هەوڵبـــدات بـــە قـــسەی خـــۆش و بەنەرمونیانی ئەو ترسەی نەهێڵێت.**

**ســەبارەت بــە پــەردەی کــچێنی، ئافرەتەکــە لەســەر پــشت ڕادەکێـشرێت و هـەردوو ڕانـی بـڵاو دەکاتـەوە، بـاش وایـە کوڕەکە بۆ نەهێشتنی ترسو بیمی کچەکە دەم بخاتە دەمی بووکەکـەو لەوەشـدا پەلـە نـەکات و ئـازاری پێنەگەیـەنێت، چونکە هەندێ پەردەی کچێنیان ئەستورە، بائەو خەسڵەتەی نـاو کۆمەڵگــە دەڵێــت خێراکــردن نیــشانەی پیاوەتیــە وەلابنرێت، چونکە نەلەگەڵ شەریعەتی ئیسلام و نە لەگەڵ زانـــست و ســـەردەمدا یەکناگرنـــەوە، پاشـــان پـــاش پاککردنـەوەی شـوێنی خوێنەکـە بـا ماوەیـەك دەرفـەتی حەسانەوەو هاتنەوە سەرخۆ بەبووك بدرێت و زاوا هەوڵبدات دڵـی بـووك ڕابگرێـت، ئەگـەریش خـوێن لەپـەردەی کـچێنی نـەهات نیشانەی ناپاکی کچەکە نییـە، بـەڵکوو وەکـو وتمـان باشـتر وایـە پێـشتر پـشکنینی پزیـشکی هـەبێت، چـونکە هەنـدێك کچ پـەردەی کـچێنییان خـوێنی لێنایـەت، هـەروەها ئـەو نەریتـەی کـە سـوپاس بـۆ خـوا لـە کۆمەڵگەمانـدا ڕوو لەنەمانـە خـوێنی کـچەکە لـە پەڕۆیـەکی سـپی دەدراو بـۆ سـەلماندنی شـەرەفمەندی نیـشاندەدرا، لەگـەڵ شـەریعەتدا یەکناگرێتەوەو حەڕامە.**







ئــەوەی لێــرەدا دەمانــەوێت قــسەی لەســەر بکــەین خــاڵێکی زۆر گرنگــە کــە تائێــستا کــەمترین قــسەی لەســەر دەکرێت، بۆیە زۆرێك لە گەنجانی موسڵمان لەوەدا تێدەکەون ئەویش بریتیە لـە شێوەکانی پـەیڕەوکردنی کـاری جنسی، لەبەرئـەوە سەرچـاوە ئیسلامیەکان لـەو بـارەوە بەشـەرمەوە قسەدەکەن، بۆیـە گـەنجی موسـڵمان لـەوەدا کـەمئاگان و زۆر تێدەکـەون و بـۆ وەرگرتنـی زانیـاریش کۆمـەڵێك نووسـین و کتـێبی ناشـەرعی دەخوێننـەوە، بۆیـە کەسـێکی وەك دکتـۆر عبدالمجید ڕۆستەم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەمە بە ڕەخنـە دەزانێت و بەبەڵگەی شەرعی قسەی لەسەر دەکات و زانیـاری لـەو بارەیـەوە دەخاتـەڕوو، ئێمـەش بـەباشمان زانـی پوختـەی ئـەو زانیاریـە لێرەدا بـۆ گـەنجانمان بخـەینـەڕوو تـا نـەچنەوە سـەر چـەند سەرچـاوەیەکی نادروسـت، هــەرروەها تـا لــەو بـوارەدا تێنەکـەون، هەرچـەندە شـەرم زۆر ڕێمـان پێـدەگرێت بەڵام ڕوونکردنەوەی ئەو لایەنە پێویستە.






# (ماف و ئەرکی ژن و مێرد)

سەبارەت بە ماف وئەرکی ژن ومێرد گرنگترین شت کە بیزانین ئەوەیە لەسەر بنەمای هەردوولا ڕادەوەستێت، واتە ئەرك وماف تایبەت بەیەكێكیان نیە، خوای گەورەش لە سوورەتی (النساء) دا دەفەرموێت ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾ النساء

بۆیە هەمیشە لەهاوسەرگیریدا ئەوە بنەما بێت بەرژەوەندی تاكلایەنە نیەو هەركارێك دەبێت پشكی خواست و بەرژەوەندی هەردوكیانی تێدا بێت.

دەكرێت گرنگترین ماف و ئەركی هەركامیان بەرامبەر بەویتر بەمجۆرە بخەینەڕوو:

## أ-ماف و ئەرکی پیاو:

١- دەبێت ئافرەتەكە خزمەتی پیاوەكە بكات و گوێڕایەڵی بێت و مۆڵەتی لێوەربگرێت، چونكە مۆڵەت وەرگرتن لەپیاو ئەركەو ئارەزوو نیە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (ان لا تخرج من بيتها الا باذنه) رواه مسلم

٢- وریای ئایینی مێردەكەی بێت و لە هەڵەو كەمو كورتیەكان ئاگاداری بكاتەوە، چونكە ئافرەتان وردبینییان







زۆره، ڕاســـتکردنەوەی هەڵـــەش بـــۆ یـــەکتر نەهێـــشتنی کەموکوڕیـەکانی خۆیانـە، دەبێـت ئـەوە لـەیاد نەکـەین ئـەوان بەیەك چاو سـەیردەکرێن و کـەمی یـەکێکیان ئـەوی تریـشیان دەگرێتەوە.

٣- خـۆی لـە داوای تـەڵاق بـەدوور بگرێـت، ئەگـەر هـاتوو پیاوەکـە لەگەڵیـدا چـاك بـوو، وەك ئـەوەی دڵـی بـچێتە سـەر کەسێکی ترو بەبێ هیچ خراپـەو کەمیـەکی مێردەکـەی داوای تەڵاق بکات، یان وەك لای هەندێك لە ئافرەتان باوە دەڵێن بۆ چاوترسـاندنی پیاوەکەیـە تـا ڕێـزم بگرێـت، پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت (ایمـا امـراة سـالت زوجهـا طـلاق مـن غـیر بـاس فحرام علیها رائحة الجنة) رواه الترمذی، صحیح.

٤- لەسـەر نـەبوونی وهـەژاری ئـازار نەچـێژێت، واتـە ئـەو ئافرەتە ئازاری دڵودەروونی پیاوەکە نەدات بەوەی پیاوەکە کەمدەســـتە، چـــونکە دڵنیابێـــت پیاوەکـــەش لـــەو زیـــاتر حەزدەکات دەوڵەمەند و هەبوو بێت، بەڵکو دەبێت دڵنـەوایی بداتـەوەو خـۆڕاگر بـن تـا خـوا دەرووی خێریـان لێبکاتـەوە، دایکمـــان عائیـــشە ڕەزای خـــوای لێبێـــت نموونـــەی لەســـەر هەژاری ماڵیان هێناوەتەوە کە جار بووە لەماڵی پێغەمبـەردا (ﷺ) بـۆ ماوەیـەکی زۆر ئـاگر نەکراوەتـەوە، دەی توانییـان






بەختەوەرانە بژین و هیچ ئازارێکی دڵ ودەروونی پێغەمبەر (ﷺ) یان نەدا.

٥- قسەو کردارێك لەڕووی پیاوەکەدا ئەنجام نەدرێت کە دڵی ئازار بدات و بێتاقەتی بکات.

٦-ئەگەر پیاوەکە داوای سەرجێیی کرد، ئافرەتەکە نەریٚ نەکات، چونکە ئەمە هەڕەشەی فەرموودەی لەسەرە.

٧-ڕێزی خزمان و کەسان و دۆستانی پیاوەکە بگرێت و بەرامبەریان هەڵوێستی ناشیرین نیشان نەدات، چونکە بیری بێت ئەویش وەك پیاوەکە خزم وکەسوکاری هەیە.

٨- لەخۆراك وخواردندا هەوڵبدات دڵی پیاوەکە ڕازیبکات، چونکە ئەوە لای پیاوان زۆر گرنگە.

٩-پەروەردەیەکی جوان و دروستی منداڵەکەی بکات وهەوڵنەدات ڕق لەنێوان کوڕو باوك یان کچ و باوکدا دروستبکات وەك ئەوەی لای هەندێك ئافرەت بەدیدەکرێت.

١٠- پێویستە ئەمانەت و نهێنی پیاوەکە پارێزراو بێت و ئافرەتەکە لەملاوە نهێنییەکانی بپارێزێت.

١١- وتەی ناشیرین و تووڕەیی و بۆنی ناخۆش و ناخاوێنی بۆ پیاو نەنوێنێت، بەڵکوو بەڕوو بۆنی خۆشەوە بەخێرهاتنەوەی پیاوەکە بکات و هەوڵبدات سۆز لەنێوانیاندا هەبێت.







هەندێك لەو مافانەی پیاو بۆ ئافرەتیش بەهەمانجۆرە، بۆیە ئەگەر لە خوارەوە هەندێك لەوانەمان نەهێنان لەبەر دووبارە نەبوونەوەیانە نەوەك لەبەرئەوەی ئەو مافەیان نەبێت.

ب-دیارترین مافەكانی ئافرەت بریتین لە:

١-پاراستنی ئایینی ئافرەتەكەو فێركردنی پێویستیەكانی ئایین ئەگەر هاتوو ئافرەتەكە نەیدەزانین، ئەو ئافرەتە مافی لەسەر پیاوەكەیەتی ئاگاداری ئایینی بێت و فێری هەر زانیارییەكی بكات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ﴾ التحريم: ٦

٢-دابینكردنی خەرجی و پێویستیە ماددیەكانی ئافرەت: پیاو دەبێت بە پێی توانای ئەو ئافرەتە لە پێویستیەكانی ژیان بێبەش نەكات و هەر ئارەزوویەكی شەرعی بەدیبهێنێت.

٣-لە كاروباری ماڵەوەدا پیاو دەبێت یارمەتی ئافرەتەكە بدات، چونكە پێشەنگی محمد(ﷺ) ئەمەی كردووە، ئیتر كێ پیاوەتی و مەردایەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) زیاترە؟ هەركەس لەوەدا گومانی هەیە با گومانی لە ڕاستی تێڕوانینی خۆی بێت بۆ ئیسلام، ئەگەرنا پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەوە یارمەتی خێزانەكانی خۆی دەدات.







٤- دەبێت پیاو لەڕووی ژنەکەیدا نەرمونیانی و لەسەرخۆیی بنوێنێت، ئەگەر تووڕەیی دەرەوەی هەبێت لەماڵەوە نەینوێنێت، ئەگەر ئافرەتەکە تووڕەو بێزاربوو، پیاوەکە بەنەرمونیانی لەگەڵیدا بجووڵێتەوە.

٥- زۆر لەماڵەوە دوور نەکەوێتەوە و گەشتی درێژخایەن ئەنجامنەدات، چونکە ئەم کارە هەم دڵی پیاوەکە دەگۆڕێت، هەم ئازاری ئافرەتەکە دەدات و ستەمێکە لە مافی ئەو ئافرەتە.

٦-لەسەر خراپەکانی ئافرەتەکە خۆراگر بێت و ئەگەر بە خراپەیەکی بێزاربووی بزانێت و چاکەیەکیشی هەیە.

٧-خۆبەخۆ هەوڵی تەڵاقدانی نەدات.

٨-پیاو خۆی بۆ ئافرەتەکە بڕازێنێتەوەو بۆنی خۆش و جلی جوان و ڕەنگی جوان و قژی شانە بکات و دەمبەخەندەو ڕووخۆش بێت.

٩-ڕەچاوی لایەنی دەروونی و بوونی غیرەی ئافرەت بکات، چونکە ئافرەتان بە گشتی غیرەیان هەیەو هەوڵدەدەن وابکەن پیاوەکە تەنهاو تەنها چاوی لەوبێت، ئەمەزیاتر بۆ پیاوانی فرەژن ڕوودەدات.

چەندین ڕەفتاری جوان و پاکیش هەن کە خۆشەویشتی و ڕێزو نێوان ژن و پیاو زیاد دەکەن و لەسەر ژن و پیاوە






**هەوڵی ئەو ڕەفتارانە بدەن، چونکە بیریان بێت ژیانی ئەوان ڕۆژوو دوو رۆژ نیەو ئەگەر پێکەوە چاك بن یەكتر كامەران دەكەن، هیچ هەڵسوكوتێكی ناشیرینیش لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەرهەمی چاك و جوانی نەبووە، ئەوەی وایان لێدەكات هەڵوێستی ناشیرین ئەنجامبدات هانەهانەو هەوڵی شەیتانە**﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ ﴾المائدة: ٩١



## قۆناغی دوای هاوسەرگیری (بوونی منداڵ)

لایـەنێکی هـەرەگرنگی نـاو هاوسـەرگیری بریتیـە لـە بـوونی منـداڵ کـە لـە لایەکـەوە تاقیکرنـەوەو ناڕەحـەتین، لەلایەکی تریشەوە خێرو چاکەو مایەی صاڵحبوونن، زۆریش پێویستە هاوسەری موسڵمان ئاگاداری ئەم لایەنەبن، لێرەدا هەوڵدەدەین پوختەیەك لەو بارەیەوە بخەینەڕوو، هەرچەندە ئـەوە پێویـست بـە وردەکاریـەکی زۆر هەیـە تـا موسـڵمانان وریـای بـن، بۆئـەوەش باشـتر وایـە بگەڕێنـەوە بـۆ کۆمەڵـە سەرچاوەیەکی کـوردی وەك (بەرنامـەی پێغەمبـەر (ﷺ) بـۆ پـەروەردەی منـداڵان ) کـە نوسـینگەی تەفـسیر بەچـاپی گەیانـدووە، یـان زنجـیرە وتـارێکی مامۆسـتا عەبدولکـەریم وتاربێژی مزگەوتی (ئیمان ) لە سلێمانی کە بە چەند وتارێك لەسەر منداڵ لە ئیسلامدا پێشکەشی کردن.

ئەگـەریش بگەڕێنـەوە بـۆ سەرچاوە عەرەبیـەکان ئـەوا نوسینەکان زۆرن، بەتایبەت بۆ پـەروەردەی منداڵ لەتەمـەنی هەرزەکاری و دواتر گەنجیدا نوسینەکانی موحەممەد قوتب (مـنهج التربیـة الاسـلامیة ) یـان چـەندین سەرچـاوەی تـر بەدەستدێنن وەك وتارەکانی شێخ موحەممەد حەسسان یان چـەندیتر تـا کەرەسـتەتان لەبەردەسـتدا بێـت بـۆ پـەیڕەوی







پـەروەردەی جـوان و پـاکی مناڵـەکانتان لەسـایەی قورئـان وسوننەتدا.

سـەرەتا لەشـەوی جوتبونـدا پێویـستە نزایـەکی سـوننەت کەلەفـەرمودەدا هـاتووە بکرێـت تـاکوو ئەگـەر لەوئەنجامـەدا منـداڵیان بـوو لەدەسـت شـەیتان وخراپـە پارێزراوبیت، فەرمووەدەکەش ئـەم نزایـەی هێنـاوە: ( بسم الله اللهم جنّبنا الشيطان و جنّب الشيطان ما رزقتنا).متفق عيه پاشان منداڵ پێش لە دایکبوونی کۆمەڵێك مافی هەیە، وەك دەستنیشانکردنی باوك یان دایکی، ئایا باوکێك چ دایکێکی بـۆ هەڵدەبـژێرێت، یـان دایکێـك چ باوکێـك بـۆ ئـەو منداڵـە هەڵدەبـژێرێت. ئەمـە دەمانگەڕێنێتـەوە بـۆ هەڵبـژاردنی هاوسـەری ژیـان کەپێـشتر قـسەمان لەسـەر کـرد، پاشـان وردەکاری پزیشکی بۆ منداڵەکە لەوکاتەی لەسکی دایکدیە، دواتر لـە لەدایکبوونیـدا ئاگاداربوون لەتەندروستی، پێدانی شـیری دایـك، هەڵبـژاردنی نـاوی جـوان بـۆ منـداڵ، بانگـدان بەگوێیـدا، سـەربڕینی مـەڕ بـۆی تـا پێـشەنگی بـە سـوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ) ەوە بکرێـت، چـونکە دواتـر هـەموو ئەوانـە ڕەنگدانەوەیان لەسەر ئەو منداڵە دەبێت. دواتر گاڵتە و یاری و قـسەی خـۆش و گەڕانـدنی منداڵەکـە تـا تەمـەنی حـەوت ساڵان، ئـیتر لـە دوای حـەوت ساڵیەوە جـەخت لەسـەر ئـەوە



دەکەیتەوە فێری ئەرکە ئایینیەکانی وەك نوێژی بکەیت، ئەمیش بۆ ئەوەی منداڵ لەوماوەدا توانای وەرگرتنی نیە و پێویستی بەوە هەیە ژیان بەخۆشی بکەوێتە بەرچاوی و سەرەتای ژیانی لێ قورس نەکرێت.

## شێوازی پەروەردەکردنی منداڵ:

تەمەنی منداڵی تا حەوتساڵان تەنها ژیانێکی سەرەتایی یاری و ڕاکەڕاکەو نابێت لە منداڵ زەوت بکرێت، بەڵکو منداڵان لەو تەمەنەدا لەکاتی گرنگترین کاری پێغەمبەردا (ﷺ) کە نوێژە چوونەتە سەرشانی.

گرنگترین پەروەردەیەك بۆ منداڵ پێویستە، ئاکار و ڕفتاری دایك و باوکیانە کەوەك فیلمێك لەبەرچاویانەو لەوانەوە کردارو گوفتارێکی زۆر فێردەبن، هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لەو بارەیەوە دەفەرموێت (کل مولود یولد علی الفطرة فأبواه یهودانه او یمجسانه او ینصرانه).

پێویستە دایك وباوك جیاکاری نێوان منداڵکانیان نەکەن، کوڕ وکچ بەجیا سەیرنەکەن، خۆشەویستی زیاتری خۆیان بە یەکێکیان نەدەن نەوەك ئەوانی تر دەروونیان بشکێت و کاربکاتە سەر پەروەردەیان، ماچکردنی منداڵان و دەستهێنان بەسەر سەریاندا و هەندێکجار چوونە ناو







جیهـانی ئـەوان و وازهێنـان لـە جیهـانی خۆمـان پێویـستە، چـــونکە بڕیـــارە تاکێـــك پـــەروەردە بکـــەین و بیخەینـــە کۆمەڵگەوە.

گرنگترین ئەو لایەنانەی کە پێویستە فێری منداڵ بکرێن و منداڵی پێ پەروەردە بکرێت:

١-لایـەنی ئـایینی: لێرەدا پێویستە پەروەردەیـەکی جوانی بیروباوەڕی منداڵ بکرێت تا بڕوای بەشـەش پایەکـەی ئیمان هـەبێت و خـواو پێغەمبـەری بڕیـاردەری بـن و هـەموو شـتی لەبەر ئـەوان خۆش بوێت، پێوەری ئایینی بالاترین پێوەری بێت، موسڵمانانی خۆش بوێت و دژ بە دوژمنـانی خـوا بێـت، ئیمان و باوەڕەکەی لـە هـەموو شتێك لای بالاترو بە بەهاتر بێت.

پاشان فێری پایەکانی ئیسلام بکرێت، نوێـژ کردن و چـوونە مزگـەوت و ڕەفتـارە جوانـە ئایینیـەکانی نیـشان بدرێت، فێری قورئان خوێندن و لێتێگەیشتن و جێبەجێکردن و دواجـاریش گەیانـدنی ئـەو قورئانـە بکرێـت، شـێوە جموجووڵـە سـوننەتەکانی ڕۆژانـەی فێـر بکرێت، دەبێـت منداڵـەکانمان پـەروەردە بکـەین تـا هـاوڕێی بـاش بناسـن و لەگەڵ ئەواندا هەڵسوکەوت بکات ئەگـەریش هـاوڕێی خراپـی تێکـەڵبوو، ئـەوا سـۆزیان بـۆی هـەبێت و یارمـەتی بـدەن،







ئەگـەرنا بـا لێـی دوورەپـەرێز بـن، چـونکە مەترسییەکی زۆر گەورە هەڕەشەیان لێدەکات.

ئـەوەی جێـی داخـە موسـڵمانان لـەمڕۆدا زۆر لـەم پەروەردەیـەدا کەمتەرخـەمن، ئامـادەن هـەرکارێك بـۆ منداڵەکـەیان بکـەن بـەلاّم ئـایین و ڕەوشـتی لـەبیر دەکـەن، بـەڵکوو پێویـستە ئەگـەر بـە مووچـەی مانگانـەش بێـت ماموّسـتاو فێرکـار بـۆ منداڵـەکانمان پەیـدا بکـەین و ئەوەشمان لا ئاسایی بێت.

٢-پـەروەردەی کۆمەلاّیـەتی: ئەمـەش ڕاهێنـانی منداڵـە تـا کەسـێکی کۆمەلاّیـەتی بێـت و تێکـەڵ بـە کۆمەڵگـە ببێـت، کەسان و خزمانی پێبناسێنین، چاکەو خراپە باوەکانی ناو کۆمەڵگەکەیان پیّ بڵێین، ڕێگـە نـەدەین لەبەردەم کۆمەڵگـەدا چۆك دابدەن و کەنارگیر بن، نابێت هەست بە کەمی یان ترس بکەن،چـونکە کـەنارگیری سـەرەتای شکستەو لـە ئیسلامدا جێی قبوڵ نییە.

٣-لایەنی زانستی:

لێـرەوە منـداڵ وا فێربکـەین شـەیدای زانسـت و کتێـب خوێندنـەوەو نووسـین بێـت، لـەکتێب و وانـەو وتـار بێـزار نـەبێت، بیبەینـە خوێندنگـەو ئاگاداریـشی بکـەین، چـونکە






ئەگەر منداڵێك پەروەردەیەكی زانستی هەبووشكستخواردنی سەختە.

٤-پـــەروەردەی ئـــابووری: منـــداڵ فێـــر بكرێـــت لەبـــەردەم ئابووریـــدا گـــیرۆدە نـــەبێت و وانـــەبێت هەمیـــشە چـــاوی لەســـەرەوە بێـــت، نـــەبوونی و دەوڵەمەنـــدی بـــەرەو گـــۆڕانی خراپی نەبەن، فێری كارو شێوەی كار بكرێت، بەڵام ئەمانەی لەسەر توند نەكرێت.

٥-پـــەروەردە ســـوننەتەكان: كـــەبریتین لـــە پـــەروەردەی مەلـەوانی، پـەروەردەی سوارچـاكی كـە بـۆ ئـەمڕۆ شـۆفێری دەگرێتـەوە، پـەروەردەی تیرهاوێـژی كـە ئەمـەش پـەروەردەی جیهادی و شێوە سەربازی دەگرێتەوە.

٦-پـەروەردەی جنـسی: ئەمـەش تێگەیانـدن و فێركردنـی لایەنـە شـەرعیەكانی بـواری جنـسیە كـە بـە داخـەوە بـە هـۆی بـوونی شـەرم لـەو بـوارەوە منـداڵانی موسـڵمانان تـا تەمـەنی سـەروو بیـست ساڵان هێشتا پەروەردەیـەكی دروسـتی ئـەو بوارەیـــان نیـــە، ئەمـــە لـــەناو كوردســـتانماندا زیـــاتر ڕەنگیداوەتـەوە، ئەگـەرنا لـە زمـانی عـەرەبی و فارسـی و ئینگلیـزیش كتـێبی شـەرعی زۆر لـەو بـوارەوە هەیـەو لـە ڕوانگـــەی ئیـــسلامەوە شـــێوەی پەروەردەكردنەكـــەیان هـاتووە.خۆزگـە موسـڵمانێكی دڵـسۆز یـەكێك لـەو كتێبانـەی







وەردەگرت و پوختی دەکردەوەو وەریدەگێڕایە سەر زمانی کوردی تانەوەی موسڵمانی کورد لەوبوارە بێئاگا نەبن.

٧-پەروەردەی سیاسی: شتێکی ڕوونە کە ڕەوشی سیاسی لە ئەمڕۆدا زۆر ئاڵۆزەو ئەگەر وریای خۆمان و منداڵانمان نەبین تێدەکەوین، بۆیە پێویستە منداڵانمان لە ڕەوشی سیاسی ڕۆژ تێبگەیەنین، نەبادا بەهەڵەی توندداا بچن.

ئەوەی لەم پەروەردەکردنەدا زۆر گرنگە ئەوەیە بەتەواوەتی بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت و بەنەرمی و وردەکارییەوە هەنگاوی بۆ بنێین بەڵکوو خوای گەورە جارێکی تر بنەماڵەگەلێکی وەك بنەماڵەی (تەیمیە)مان پێببەخشێتەوە، بڕواننە ئیمانی ئیبن تەیمیە کە لەگەڵ شیرپێدانیدا بەلایەنەکانی تر گۆشکراوە، ئیبن تەیمیەی کورد توانی هەموو جیهانی ئیسلامی بەرەو پێش ببات و تا ئەمڕۆش کاریگەری بمێنێت و خوێندنگەیەکی گەورەی لە ڕەوتی ئیسلامی جیهاندا هەبێت.







## (ئەو شتانەی پێویستە خۆمانی لێبپارێزین)

**کۆمەڵێ شت هەن خێزانی موسڵمان دەبێت ئاگاداریان بێت و خۆیانی لێبپارێزێت، لەوانە:**

**١-ئەوانەی پەیوەست بە ناوماڵن: ئاگاداری هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ یەکتری بن، ڕێگە نەدەن ناکۆکی لە ماڵیاندا هەبێت و هەرچیەکیش ڕوویدا بەلایەنی کەمەوە با یەکێکیان ڕۆڵی چاکساز ببینێت، پاشان زۆر ئاگاداری کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و پێناوەکانی بن، تەماشاو گوێگرتنیان لە قەدەغەکراوەکانی خوا نەبێت.**

**٢-پەیوەست بەدەرەوە: سەرەتا ئەوەی گرنگە دراوسێکانتانن، چونکە کۆمەڵێك فەرموودەی زۆری لەسەرە، دراوسێش لە هەموو خزمان لێتان نزیکترە، بۆیە هەوڵبدەن دڵسۆزو دۆستی یەکتربن، نەوەك هەرکامەو ژیانی ئەویتر ناخۆش بکات. ئەمە جگە لە بەرپرسیارێتی بەردەم دادگایی خوایی، هەروەها زۆر ئاگاداری پەیوەندیە خزمایەتیەکان بن، چونکە نەفرینی خوا لەو کەسانە کراوە کە پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنن، هەروەك لە فەرموودەشدا باس لە پەیوەندی خزمایەتی کراوەو بە پێناوێکی ڕۆزی و تەمەن درێژبوون دانراوە، ئیتر دوای ڕەزامەندی و فرمانی خوا و**







**پێغەمبەرەکـەی(ﷺ) چیمان بۆ دەمێنێتـەوە؟؟ تـەنها کەسـە دڵمـردوو یـان کەمهەسـتەکان دەتـوانن خزمـان لـە بیر بکـەن، جگـە لــەوە خۆتــان ســەرقاڵ مەکــەن بــە ڕەخنــەو کــەمو کورتیـەکانی خـەڵك و هەوڵبـدەن پەڵـەکانی خۆتـان لابـدەن، ئینجـا دڵسـۆزی بـۆ کەسانیتر بنـوێنن وەك پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێت (طوبى لمن شغله عيبه من عيوب الناس) پاشـان زۆر ئاگــاداری قــسەهێنان و بردنــی نێــوان کەســان و خێزانەکان بن چونکە تاوانێکی گەورەیە.**

**٣-خۆپاراستن لە جادوو: ئەوەی لە ئاینی ئیسلامدا لەسـەر جـادوو هـاتووە ئەوەیـە کـە شـتێکی ڕاسـتەو بـوونی هەیـەو زۆریش مەترسیدارە، لـەم بارەشەوە چەندین نووسین هەیە، بــەکوردی بێــت یــان بــە عــەرەبی، لــە ڕوانگــەی قورئــان وســوننەتەوە وردەکــاری ئەوەشــیان خــستۆتەڕوو، لــە جۆرەکانی جادووش بریتیە لە نانەوەی دووبەرەکی و ڕق لـە نێوان ژن‌ومێرد دا وەك خـوا دەفـەرموێت ﴿ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ ﴾ البقـرة: ١٠٢، یـان تووشـبوونی لاوازی جنسی پیاو بەردەوام حەزدەکات بچێتە لای ژنەکەی، کەدەچـێتە لای توانـا جنـسیەکەی لاوازەو ناتوانێـت یـان دەست لە کۆئەندامی زاوزێی ئافرەتەکە دەدەن و لای پیاواکە**







**وادەردەکەوێت بێوەژنەو پەردەی کچێنی نیە، بەمە دەوترێت جادووی(تغوير)، یان جادووی خۆشەویستی: کچێك یان کوڕێك جادووی لێدەکرێت تا بەرامبەرەکەی زۆر خۆش بوێت ئایا لە پێش هاوسەرگیریەو کچێك یان کوڕێك دەیەوێت بە هاوسەری بگرێت بۆ ئەوە جادووی بۆ دەکات، یان دوای هاوسەرگیریەو دڵی دەچێتەسەر جگە لە هاوسەرەکەی، هەریەك لەم جادوانە هاوەڵدانانە بۆ خواو دروست نیە، بۆ خۆپاراستن خوێندنی سورەتی فاتیحەو ئایەتولکورسی و سورەتی (ئیخلاص و فەلەق و ناس)و زۆر وتنی أستغفر الله و نزاکانی خۆپاراستن کە لە (حصن المسلم)دا هاتووە لەگەڵ چەند کارێکی گشتی وەك پەناگرتن بە خوا لە کاتی چوونە حەمام و کردنی نزاکانی بەیانیان و ئێواران، وتنی بسم الله الرحمن الرحيم پێش ڕشتنی ئاوی گەرم، بۆ چارەسەری تووشبوانیش وردەکاری زۆر هەیەو پێویستە بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکان یان بۆ لای کەسانی شارەزا.**







# (چەند پێشنیارێک بۆ هەموان)

**ئەمە پەیامێکە بۆ هەر لایەك و کەسێك کە کەمترین هەوڵی خۆی بخاتە گەڕ تاگەنجانی ئەم خاك و ئوممەتە دامەزراو بکەن، چونکە ئەگەر فریای گەنجان نەکەوین دەبێت چاوەڕێی بەرهەمیشیان نەبین، نەبوونی بەرهەمی گەنجانیش واتە نەبوونی زۆربەی بەرهەمی ژیان، چونکە گەنجان بنەڕەتی هەرکارو پرۆژەو ڕابوونێکن.**

**ئەم وتەی لێرەدا دەیڵێین پەیامێکە بۆ ئەوانەی توانایان هەیە، لەم خاڵانەدا دەیخەینەڕوو:**

**١- هەنگاوی گرنگ و کارا لە دەست دەوڵەت و حکوومەتدایە تا ئاسانکاری بۆ گەنجان بکەن، ئەمەش هەم خستنەڕووی خواستی گەنجان و هەم گەیاندنی پەیامێکەو بەرپرسیارێتی دواڕژمان لەسەر نامێنێت.**

**٢-دەبێت کوڕان و کچان پێش هەموان سەختیەکانی هاوسەرگیری کەمبکەنەوە، هەر ئەو خواستە سەختانەی ئافرەتانە وا دەکات کوڕانێك دوورەپەرێز بن و هەردووکیان بە تەنهایی بمێننەوە، مەئەگەر کوڕانیش وەك ئێوە حەزیان لە خۆشیەکانی ژیان نیە؟ دەسا هەردوولا یارمەتیدەری یەکتر بن.**







٣- باوكان و دایكان یان دەورووبەر با مەرجی قورس و بیانوو دانەنێن، دادگایی خودایی هێندە ئاسان نیە كە ئێمە حەلاڵەكانی خوا قورس بكەین و بڕوبیانوو بگرین، ئەگەر تەنها قسەیەكیش هەبێت لەسەرنەگرتنی كارێكی خەیری وەك هاوسەرگیری یان قورسكردنیدا دڵنیابە لای خوا تاوانباریت و سنووری خوات شكاندووەو دڵڕەنجاندنی خواو ڕازیكردنی شەیتان بەرهەمەكەیەتی.

٤- زانایانی ئایینی لەمەدا بەرپرسیارێتی گەورەیان لەسەر شانە، ئەمە ئەركی گەورەی ئەوانەو هیوای گەنجانی موسڵمان بەوانە، با هەوڵ بدەن خۆیان بكەنە پێشەنگ، ئەگەرنا وتەی بێكردار بەرهەمی بەڵێنی بێكرداری دەبێت،پاشان دوای بەكردەوە ئەنجامدان، با هەوڵی بێداركردنەوەو هۆشیاركردنەوەی خەڵك بدەن، چونكە خوا دەزانێت هەر تاوانێك بەوهۆیەوە گەنجانمان تووشی ببن ئێمەش لەسەری سزا دەدرێین، ئەوە چ زات و غیرەتێكە لەبەرامبەر وەستانی ڕێنماییەكانی خواو پێغەمبەرەكەیدا پەیدامان كردووەو چ بەرچاو ئەستووریەكە بووینەتە مایەی خولقاندنی كەشێكی لەم جۆرە كە گەنجانی تیادان؟ جارێكیتر هەستن و ڕۆڵی خۆتان ببینن وەك چۆن بە گوفتارو كردارتان مێژووی ئیسلامیتان ڕازاندەوە.






**٥- کەسـانی بـە توانـاو خـاوەن سـەرمایە ئەگـەر هـەرکامتان ماڵێکی باوەڕدار پێك بهێنن و گەنجێك لە خراپە بگەڕێننەوەو دڵـی گـەنجێك کامـەران بکـەن، بیرتـان بێـت لـە ئـەنجامی ئـەو هاوسەرگیریەوە تا ڕۆژی دوایی هەر کارێکی خێر بکەوێتەوە ئێـــوەش تیایـــدا بەشـــدارن، ئەگـــەرنا ئـــەوەی ئـــەمڕۆ لەدەســـتماندایە ئەمانـــەتی خواییـــەو دووســـبەی لێمـــان دەسێنرێتەوەو لێپێـچینەوەی لەسـەرە، بۆیـە پێویـستە وریـا بین.**

**خوایـە ئەمـە ئـەرکی گەیانـدن بـوو، لێپێـچینەوەش لەسـەر جێبەجێکردنی بۆتۆیە...**






# (کۆتایی )

گەنجانی ئازیز، ئەمەی لێرەدا خرایەڕوو سەرەتاو پوختەیەك بوو لەبارەی هاوسەرگیریەوەو شەریعەتی ئیسلام بە وردەکاریەکی زۆرەوە ڕێنمایی لەسەرهێناوە، بەڵام ئەوەی مەبەستی ئێمە بوو بەرکوڵێك بخەینە بەردەستتان تا ببێتە سەرەتای زانیاریتان و لێرەوە هەنگاو بەرەو زانیاری زیاتر بنێن.

ئەوەش بزانن کە کەمبوونەوەی ڕێژەی هاوسەرگیری کارێکی خراپەو ئێمە لێی بەرپرسیارین و هیچ بیانوویەکمان بۆ کەنارگرتن لە هاوسەرگیری نییە، وەك پێشتر بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و ڕای زانایان ئەوەمان ڕوونکردەوە، بۆیە تا دەتوانن زووتر و ژیرانەو دڵسۆزانە پیشڕەوی بکەن و هەوڵبدەن ئەگەر بەتەنها قسەیەکیش بێت گرفتەکانی بەردەم هاوسەرگیری نەهێڵێن، چ بۆ خۆتان بێت یان بۆ گەنجانی تر. بەڵکوو ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ ﴾ المائدة: ٢) هەروەها هەموان هەوڵبدەن هۆشیاری هاوسەرگیری ئیسلامی بڵاوبکەنەوە، چونکە وا بەرەو نامۆیی دەچێت. قور بەسەر کۆمەڵگەیەکیش کە هاوسەرگیری تێدا لاوازە وەك نموونەی ڕۆژئاوا، ئەوەش بزانن لەو کارە خێرەدا لەیەکەم







هەنگاوەوە تا کۆتا هەنگاو خواتان لە گەڵەو موژدەو بەڵێنی خوا هەیە کە یارمەتیتان بدات.

هەر ترسێکیشتان لێی هەیە تەنهاو تەنها ترسی شەیتانیەو بەس، چونکە خودا دەفەرموێت ﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةٗ مِّنۡهُ وَفَضۡلٗاۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٢٦٨ ﴾ البقرة: ٢٦٨

دوا وتەم ئەوەیە هەرکەس ئەم بابەتەی خوێندوەتەوەو لەنزای خێر بێبەشم نەکات ئەگەر تەنها یەك نزاش بێت، ڕەخنەو پێشنیارەکانیش ئاگادارمان بکەنەوە بەڵکو بتوانین زیاتر لەم بوارەدا خزمەت بکەین.

اللهم صل على محمد وعلى ال محمد كما صليت على ابراهيم و على ال ابراهيم و بارك على محمد وعلى ال محمد كما باركن على ابراهيم و على ال ابراهيم انك حميد مجيد







**بەرهەمەکانی نووسەر:**

**١. دەوڵەتی عوسمانی: د.علی محمد الصلابی وەرگێرانی بە هاوکاری أحمد عبدالرحمان أحمد**

**٢. مەغۆل لە مێژوودا: د.فؤاد عبدالمعگی الصیاد وەرگێڕان**

**٣. چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی: شێخ محمد خضری بك وەرگێڕان**

**٤. دەوڵەتی سەلجووقیەکان: د.علی محمد الصلابی وەرگێڕان بەهاوکاری شاهۆ عومەر عارف**

**٥. مێژووی نوێی جیهان: چەند نووسەرێك، وەرگێڕان بە هاوکاری فارووق محمد محمدأمین**

**٦. بەراوردێك لەنێوان غەزالیو ئیبن تەیمیەدا: د.محمد رشاد سالم وەرگێڕان**

**٧. مێژووی دەوڵەتی عەبباسی: د.محمد سهیل طقوش وەرگێڕان**

**٨. مێژووی ئەییووبیو مەملوکیەکان: د. أحمد مختار العبادی وەرگێڕان**

**٩. پوختەی مێژووی ئیسلامی: د.محمد سهیل طقوش وەرگێڕان**







١٠. جەنگە گەورەکان و فتوحاتە ئیسلامیەکان: محمد سعید موسی وەرگێڕان

١١. ئیماننناسی نووسین

١٢. ژیانی پێغەمبەر بۆ منداڵان و تازەپێگەشتوان نووسین

١٣. ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەر بۆ مندالان و تازەپێگەشتوان نووسین

١٤. پەیامێك بۆ گەنجان نووسین

